## ناوەرۆک

### ب. ئەوان



### پ. ئەو

### ت. چوارینەی پەیوەست

## ج. چوارینەکان

## ج.پەخشانە شیعر



## ح. شیعرە سەرەتاییەکان

پاشکۆکان

## ١. کۆچی دوایی



## ٢. ساڵوەگەڕ

# وەفا، ژیان، شیعر

*ئەنوەر سوڵتانی*

کاکم ـ عومەر سوڵتانی(وەفا) ڕۆڵەی سەردەمێکی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی- سیاسیی کوردستان و ئێرانە:

ـ لە سەردەمی حوکمی ڕەزا شای پەهلەوی و کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانیدا لە بۆکان هاتۆتە جیهان (١٣١٨ = ١٩٣٩ ز)؛

ـ لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا چۆتە قوتابخانە و بۆ ماوەی نزیک بە یەک ساڵ بە کوردی وانەی خوێندوە، هاوڕێ لەگەڵ قوتابیانی بۆکانی بە کۆڵانەکانی شاردا گەڕاوە و "چەند شیرینە لام دار و بەردی وەتەنم" ی چریکاندووە (١٣٢٤= ١٩٤٦)؛

ـ بە هەرەسی کۆمار و گەڕانەوەی مۆتەکەی ڕژێمی ئێران، وەک زارۆکێک ڕەنجی کێشاوە، بگرە و بکوژەی شار و ناوچەکەی بە چاوی سەر بینیوە و عەلیبەگی یەکشەوەی بە داری بێدادی سەر حەوزە گەورەوە دیوە؛

ـ لە قوتابخانە دەستی کردووە بە فارسی خوێندن و ماوەی ٦ ساڵ قوتابی پلە یەکەمی پۆلەکان بووە (٦-١٣٢٥= ٥٢-١٩٤٧)؛
ـ کێشەی ناسنامە و تەمەن لە لایەک، و گرفتی ناو بنەماڵە لە لایەکیتر، لە خوێندنی دوور خستۆتەوە (١٣٣١=١٩٥٢)؛

ـ لە ساڵانی ١٣٣١/٢ (١٩٥٢/٣)دا دووکانێکی بچووکی رۆژنامەفرۆشی لە سەر شەقامی تازەی بۆکان کردۆتەوە.
لەو ساڵانەدا، زوڵم و زۆری رژێم لە کەمیی دابوو و بۆکانیش بووبووە گرێپووچکەی چەندین گرفتی کۆمەڵایەتی ـ چینایەتی و مەکۆی راپەڕین و سەرهەڵدان. لە ناو شار بەرگدروو و کاسبکارانی هەژار دژ بە ستەمی چینایەتی ئاغاواتی شار راپەڕیبوون و بۆکانیان کردبووە گڕکانی خەبات و بەربەرەکانی لەگەڵ چەوسێنەران؛ لە گوندەکانی بەری رۆژهەڵاتی شاریش (گۆل، ئاڵبلاغ، جامەرد و...) وەرزێڕانی فەیزوڵلابەگی لە ئاغاوات هەستابوونە سەرپێ.
دووکانی وەفا پێگەی گرنگی راپەڕیوەکان بوو؛

ـ بە سەرکەوتنی کۆنەپەرست و ئیمپریالیستەکان و تێکشکانی حکوومەتی دوکتۆر موسەددیق لە ئێران، قۆڵبەست کراوە و خراوەتە زیندانی مەهاباد. دوای ئازادیی، بۆ ماوەی ١٥ ساڵ لە ژێر لێپرسینەوەی دادگای نیزامیدا ماوەتەوە (٤٧-١٣٣٢= ٦٨-١٩٥٣)؛
ـ بە "بەرنامەی ئیسلاحاتی ئەرزی" شا و دابەش کرانی زەویوزار بە سەر وەرزێڕاندا، هەڵوێستی دژی ئاغاواتی لەلا قایمتر بووە و ئاهێکی وەبەر هاتۆتەوە. لە وەسفی بەرنامەکە و بۆ هاندانی رەشایی

و جووتبەندەی کورد شیعری گوتوون و بە شانوباڵی شایدا هەڵداوە ـ کە "زنجیری کۆیلایەتی لەسەر ملی وەرزێڕان داڕنی" (١٩٦٢=١٣٤١)؛

ـ کۆدیتای قاسم لە عێراق، گەڕانەوەی بارزانی بۆ کوردستان و سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلوول شوێنی تایبەتی لەسەر داناوە و سەرنجی بەرەو مەسەلەی کورد راکێشاوە (١٣٣٧=١٩٥٨)؛

ـ بڵاو بوونەوەی رۆژنامەی "کوردستان" لە تاران و دامەزرانی رادیۆی کوردی کرماشان، دەرەتانی بڵاو کردنەوەی شیعرە کوردییەکانی بۆ خوڵقاندووە (١٣٣٨=١٩٥٩)؛

ـ چارەسەر نەبوونی کێشەی چینایەتی دوای بەرنامەی زەویوزار و بێوەڵام مانەوەی پرسی کورد، بەرەو بێدەنگی و ماتییان بردووە و لە نێوان ساڵانی ١٣٤٥ تا ١٣٥٧دا لە شیعر و شاعیری دوور کەوتۆتەوە. بە کار و کاسبییەوە خەریک بووە، بەڵام لە هەموو ئەو ساڵانەدا وەک مرۆڤێکی بەرپرس، عیلمانی و سوسیالیست، دژایەتی خورافاتی کۆمەڵایەتی کردووە، کتێبی فرۆشتوە، و تەنانەت کاتێ کە ژیانێکی باشتری ئابووری بۆ خۆی و بنەماڵەکەی پێکهێناوە، لە خوێندنەوەی کتێب و چاپەمەنی پێشکەوتنخواز نەوەستاوە. هەر لەو ساڵانەدا و دوای ئەوەی من کەوتمە زیندان، بە هۆی هاودەستی کردنی منەوە، کەوتۆتە بەر چاوەدێریی بەردەوامی ساواک و دووکانەکەی بۆتە مۆڵگەی کەسانی ساواک کە تا مۆخی ئێسقان

دژیان بوو ورقی لێیان دەبوەوە. من بۆ ئەو بەڵایەی تووشم کرد، تا ڕۆژی مەرگ خەجاڵەتی مامەوە. (٥٤-١٣٥١= ٧٧-١٩٧٢)؛

ـ بە خۆش بوونی ئاگری ڕاپەڕینی گەلانی ئێران (١٣٥٧=١٩٧٩)، باوی هەنگاوی خۆش بووە و بە سەری پیری کەوتۆتەوە کاری گەنجانە کردن و هاو هەنگاویی لەگەڵ لاوانی ڕاپەڕیو لە بۆکان؛

ـ ئینجا داسەپانی شەڕی مەلاکان بە سەر گەلی کورددا، ئاوارەیی، ژیان لە ورمێ و کەرەج و تاران؛ و

ـ گەڕانەوەی بۆکان، نەخۆشی، لە جێدا کەوتن، و پاشانیش سەرنانەوە؛

یادی بەخێر بێت!

لە ماوەی ژیانێکی ٦٠ ساڵەدا، وەفا سەردەمی جیاجیا و ژیانێکی پڕ لە گۆڕان و وەرچەرخانی بردە سەر، ئەوەی لە هەموو ئەو سەردەمانە و لە بڕگەی جیاوازی ژیانیدا، نەگۆڕاوە، نوێگەری و نوێخوازی بوە. چ لە ژیانی شەخسی و بنەماڵەیی، چ لە ئیش و کار و کاسبی و چ لە کاری هونەری و شاعیریدا وەک کەسێکی ڕچەشکێن، نوێخواز، و دژی دۆخی کۆن ماوەتەوە. هەرگیز لە رابردوودا نەژیاوە و تەنانەت کاتێ کە لە جێوبانی مەرگدا کەوتوە، لە بیری دواڕۆژ و ژیانی نوێدا بووە.

ناسینی وەفا- ژیان و جیهانی شیعرەکانی، بە بێ چاوبڕینە ئەو مەنزەرە گشتییە لە گونجان نایەت؛ ئەوەش کە دەکرێ لە وەفا فێر بین نوێخوازی و روو وەرگێڕان لە دیاردەی کۆنە. هەر ئەو رۆحەش بوو کە هانی دا لە ئەنگوستە چاوی کوردستانی دوای هەرەسی کۆمار و تێکشکانی حکوومەتی میللی موسەددیق و حوکمی رەشی شا و تەیمووری بەختیار و ساواک دا، شەوقی شیعری بەرپرس بخاتە زوڵماتی رۆژهەڵاتی کوردستان و لە حەوزی بچووکی ئەو ساڵانەی کۆمەڵگای بۆکاندا، شاماسیی شیعری نوێ راو بکات.

❊❊❊

ئەوەی وەفا کەنگێ دەستی بە شیعر گوتن کردبێت، بۆ من روون نییە. دەزانم شیعر لەو ساڵانەدا کەرەسەیەکی
لەباربوو بە دەست خەباتکارانەوە و لەو شوێنانەی کە نەخوێندەوارییی برستی لە خەڵک بڕیبوو، شیعر هاسانتر لە پەخشان دەچووە ناو هەست و بیری کۆمەڵانی خەڵکەوە؛ دەشزانم کە وەفا لە سەردەمی رۆژنامەفرۆشیی پێش کۆدیتای ١٣٣٢ لەگەڵ شیعری لاهووتی کرماشانی و محەمەدعەلی ئەفراشتە و ئەبوتوڕابی جەلی دا ناسیاویی باشی هەبوو و هانی منیشی دەدا بیانخوێنمەوە. بەڵام دوا بە دوای کۆدیتا، "کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز" هەمووی بوونە دەستەچیلەی ئاگری تەندوور و هیچیان لێ نەما کە ئەمرۆ پشتی پێ ببەستین.

یەکەم شیعرە فارسییەکانی وەفا لە دوای کۆدیتای ١٣٣٢ گوتراون و لە گۆڤارەکانی چاپی تاراندا بڵاو بوونەتەوە. بەڵام کەی دەستی بە شیعری کوردی کردبێت، لێم روون نییە. ئەوەندەی بزانم لە سەردەمی دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان لە تاران واتە ساڵانی نێوان ١٣٣٨ و ١٣٤٢ (١٩٥٩ و ١٩٦٣) شیعری کوردی وەفاش هاورێ لەگەڵ شیعری سوارە و هاوار و چاوە لەوێدا بڵاو کراوەتەوە.

رۆژهەڵاتی کوردستان لەو ساڵانەدا پەیوەندییەکی گەلێک کەمی لەگەڵ باشووری وڵات هەبوو، کەسانی وەک عەبدولواحید نووری و شێخ نووری شێخ ساڵح بۆ کەمتر کەسێک ناسرابوون و گۆران دووراو دوور ناوێکی هەبوو ئیتر هیچ. پەیوەندییەکان تەنیا لەگەڵ شیعری فارسی بوو و بە گشتی شیعر لەوێ لە شیعری فارسی و هەندێکیش عەرەبیدا خولاسە دەبوەوە. دیارە لە گوندەکان و شوێنی دوور لە دەستی حکوومەت نیزامی بەختیار و پاشان ساواک، حیسابەکان هەندێ جیاوازییان هەبوو، بەڵام لەوێ شیعری نوێ باوی نەبوو و قسەی یەکەم، نالی و مەولەوی و تاهیر بەگی جاف و شێخ رەزا دەیانکرد!

ماوەیەک دواتر، کە خوێندکاری کورد لە زانستگەکانی تاران و تەورێز دەستیان بە خوێندن کرد، هەندێ شت گۆڕا و بۆ نموونە پەیوەندی لەگەڵ چەمکی نوێی شیعری باشووری کوردستان سەری هەڵدا.

*بەڵام لە چەقی ساڵی ١٩٥٣ و کاتێ کە وەفا یەکەم شیعری نوێی فارسی خۆی گوت، هیچکام لەو گۆڕانکارییانە سەریان هەڵنەدابوو و تەنیا بیری سنووربەزێنی ئەو بوو رچەی نوێکردنەوەی شکاند و بەوە، بوو بە پەیامهێنەری نوێخوازیی لە ناوچەکە.* **بە ماوەی سێچوارساڵ دوای رچە شکێنیی ئەو، یەکەم شیعری نوێی کوردی لە**

ڕۆژهەڵاتی کوردستان گوترا و "سێکوچکە"ی نوێخوازیی شیعری کوردی ڕۆژهەڵات پێکهات. بەڵام هەر سێ کەسەکە: سوارە، هاوار و چاوە، خوێندکاری زانستگەی تاران بوون و لە ڕاستیدا لە دەرەوەی کوردستان بەرەو پیری نوێخوازی چوون، لە کاتێکدا وەفا لە بارودۆخی ناوخۆی کوردستان دا ڕووی لە شیعری نوێ کردبوو.

لە ڕاستیدا، نوێخوازی، هەڵکەوت یا ڕووداوێکی لەپڕی ناو ژیانی هونەریی وەفا نەبوو، بەڵکوو بەشێک بوو لە گەوهەر و زاتی ئەو. وەفا شاعیریش نەبوایە و بۆ نموونە وێنەگەری بکردایە، چیرۆکنووس یا مۆسیقاژەنیش بوایە، لە بواری کاری خۆیدا، ئەسیری نەریت و داب نەدەمایەوە و پەلی بۆ "ئەوپەڕ"ی دیاردەکان دەکوتا. بەڵگەی باش بۆ ئەم بۆچوونە، شیعرەکانی ساڵانی دوایی وەفان کە لەم کتێبەدا دەکەونە بەرچاو. لە شیعری ساڵێک و دووان پێش نەخۆشی و لە جێگەدا کەوتن، دیسان وەفا سنوور دەبەزێنێت و لە ژێر تەئسیری سوهراب سپێهریدا، چەند پارچە شیعر دەڵێت کە پێشتر ئەو بوارەی تاقی نەکردبۆوە یاخود شیعری عەرووزی دەڵێت کە پێشتر بە لایدا نەدەچوو:

*"ئاخۆ ڕۆژێ بە چاوم ئەیبینم..."*

ئەوە وەفایە و جیهانی بەرینی بێسنووری خۆی. وەفا بەم سنوور بڕین و چوارچێوە شکاندنانەوە وەفایە!

با هەر لێرەدا دەستنیشانی ئەو راستییە بکەم کە بە داخەوە بەشێک لە شیعرەکان رێکەوتی گوتنیان دەستنیشان نەکراوە و بەم پێیە ئەستەم دەبێت بزانین کام شیعر پێش کامی دیکە گوتراوە. دیاری کردنی رێکەوتەکان لەو بارەیەوە بەسوود دەبوو و دەمانزانی شاعیر لە چ قۆناغێکدا کام شێوازی رەچاو کردووە و کەی ئەو قۆناغەی بڕیوە. بەڵام من کە ئێستا دەستنووسی هەموو شیعرەکانم بە دەستخەتی خۆی لەبەر دەستدایە و هەروەها دەستم بە هەندێ ژمارەی رۆژنامەی کوردستان چاپی تاران رادەگات کە شیعری ئەویان تێدا بڵاو کراوەتەوە، بە یارمەتی ئەو دوو سەرچاوەیە و هەروەها بە گوێرەی بیروڕا گۆڕینەوە و ئەو وتووێژانەی کە بە درێژاییساڵیان لەگەڵ یەکتردا هەمانبووە، دەتوانم رەوتی شیعری وەفا و قۆناغەکانی کاری شاعیریی ئەو تا رادەیەک بەم شێوەیە دەستنیشان بکەم گەرچی وا هەیە نەتوانم جەمسەرەکان بە باشی بە یەکەوە ببەستمەوە:

### ساڵانی ١٣٣٢ تا ١٣٤٢:

لەم ساڵانەدا، وەفا بە گشتی بە شیعری فارسییەوە خەریکە و بەرهەمەکانی لە هەندێ گۆڤاری فارسی چاپی تاران بۆ نموونە "امید ایران"، "ترقی"، "آسیای جوان"، "تهران مصور" و...دا بڵاو دەبنەوە. هەر لەو ساڵانەدا لە رێگای شیعر گۆڕینەوە لەگەڵ هەندێ شاعیری ئێرانی وەک شەهید "سەعید سوڵتانپوور" و "نوسرەت رەحمانی" ناسیاویی پەیدا دەکات. سەعید دەبێتە دۆستێکی نزیک و جێگەی بڕوای، کە بۆ چاپی کۆمەڵە شیعری "سرود پرستو"ش یارمەتی دەدات. هەر لەو ماوەیەدا خەڵاتی یەکەمی شیعری رادیۆ دیهلی

دەباتەوە و وەزیری پەروەردەی ئێران لە باڵوێزخانەی هیندوستان لە تاران خەڵاتەکەی دەداتێ.

هەر لەم قۆناغەدا، رۆژنامەی کوردستان لە تاران بڵاو دەبێتەوە و رادیۆی تاران و کرماشان دەکرێنەوە و پرۆگرامی ئیسلاحاتی ئەرزی رژیمی شا بەڕێوە دەبرێت. هەر سێ ئەو رووداوانە شوێنی لە سەر دادەنێن و بەرەو شیعری کوردی دەکێشن. شیعرەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر لە رۆژنامەکەدا بڵاو دەبنەوە و هەندێ جار لە رادیۆ کرماشانیش دەخوێنرێنەوە. لەو ماوەیەدا لەگەڵ شاعیرانی دیکەی بۆکان وەک "ئاوات"، "حەقیقی" و "ئیبراهیم ئەفخەمی" دۆستایەتی و هاتوچۆی دەبێت کە سەردانی دووکانە کتێبفرۆشییەکەی دەکەن، بەڵام دۆستایەتییەکی گەرموگوڕتر لەگەڵ سوارە و هاوار دادەمەزرێنێت کە هەردووکیان نوێخوازن و هاوکاریی رۆژنامەی کوردستانیش دەکەن.

شیعری ئەم سەردەمەی وەفا هەمە چەشنەن: فارسی، کوردی، عەرووزی، نوێ (چوارکۆپلە و شیعری سپی بێکێش و سەروا). وەفا خەریکی ئەزموون کردنە و پەل بۆ هەموو بوارێک دەهاوێت. ناوەرۆکی شیعرەکان غەرامی، کۆمەڵاتی و سیاسین.

### ساڵانی١٣٤٢ تا ١٣٥٧

لەم قۆناغەدا، وەفا دووکانی کتێبفرۆشییەکەی دەگۆڕێت و کەرەسەی ناوماڵ دەفرۆشێت. لە باری داراییەوە ژیانێکی رێکوپێکتری دەبێت، ژن دەهێنێت و دەبێتە باوکی چەند منداڵ،

باوکمان کۆچی دوایی دەکات و من لە کوردستان شاربەدەر دەکرێم و پاشان دەکەومە زیندانەوە. وەفا بەرپرسیاریەتی ژن و منداڵ و هەروەها دایک و هەر دوو خوشکەکانمانی دەکەوێتە ئەستۆ. کار و کاسبی و ئەرکی ژیان لە شیعری دوور دەخەنەوە و بە گشتی بەرهەمێکی کەمتری شیعریی دەبێت گەرچی لە خوێندنەوە و نووسین ناکەوێت و بۆ نموونە لە ساڵی ١٣٤٧دا شیعرێکی فارسی بە ناوی "شەو" (شب) لە گۆڤاری "خوشە"ی چاپی تاراندا بڵاو دەبێتەوە[١]. بەڵام بە گشتی ئەو بڕگەیەی ژیانی وەفا سەردەمی بێدەنگ مانەوەیە و من خوم شیعری تایبەتی ئەوساڵانەییم لە بیر نییە و ئەوانەش کە گوتراون، بۆ نموونە هەندێک لە چوارینە کوردییەکان، بڵاو نەبوونەتەوە. وا هەیە هۆکاری مەسەلە، داخرانی رۆژنامەی کوردستان و بێدەنگ نی رادیۆی کرماشان و لە ژوور ئەوانەشەوە زەخت و زۆری لەڕادە بەدەری رژیم لە ماوەی ساڵانی کۆتایی تەمەنی نگریسی واتە ١٣٥٠-١٣٥٦ بێت. بەڵام بێگومان رەونەقی ئابووری ئەو ساڵانەی ئێران و گەشە سەندنی کار و کاسبی خۆی، هۆکارێکی گرنگ بوون لە دوورکەوتنەوەی وەفا لە شیعر. ئەو شیعرانەش کە دەگوتران، بە گشتی کوردی بوون،

فۆرمی غالب لە شیعرەکانی ئەو بڕگەیە دا نوێ و ناوەرۆکیش غەرامین، شیعری بەرپرسانەشیان لە ناودا دەبینرێت.

## ساڵانی ١٣٥٧ تا کۆتایی تەمەن (١٣٨٤):

لەم بڕگە زەمەنییەدا وەفا لەژێر کارتێکەریی شۆڕشی گەلانی ئێران و هەڵوەشانەوەی رژیمی پەهلەوی، سەر لەنوێ بەرەو پیری

---

[١] بڕوانە وتاري (سەرەتاي نوێخوازي ...) نووسيني وەفا، لە لاپەڕە ي ئەم کتێبەدا

پەری شیعر دەچێتەوە و لە ماوەی ژیانی تاران و پاشان گەڕانەوەی بۆکانیدا، بەرهەمێکی زۆر دەخوڵقێنێت. زیاترین شیعرەکانی وەفا لە ماوەی ئەم ساڵانەدا گوتراون. لەم دەورەیەدا وەفا خەریکی ئەزموونکارییە لە شیعردا، شیعری شاعیرانی کوردی باشوور دەخوێنێتەوە و کارتێکەریی شێرکۆ بێکەس و عەبدوڵڵا پەشێو لە شیعرەکانیدا دەبینرێت. بە هەمان شێوە، لانی کەم لە یەکێ لە شیعرەکانیدا تەئسیری هێمن بە روونی دیارە (*ئاخۆ ڕۆژێ بە چاوم ئەیبینم...*) لە چەند شیعری دیکەیدا کارتێکەریی "سوهراب سپهێری" و "فروغ فەڕوخزاد" بەرچاون، گەرچی بە فارسی شیعر ناڵێت و هەموو ئەو رەنگدانەوانە لە شیعرە کوردییەکانیدا دەردەکەون.

ناوەرۆکی شیعری کوردی وەفا لە بڕگەی جیاجیای ژیانیدا دەگۆڕێن. لە ئەوینێکی تێکەڵ بە خەیاڵەوە بۆ بەرپرسیایەتی کۆمەڵایەتی و بۆ ئەوینی راستەقینە و سەر لەنوێ بۆ شیعری سیاسی و کۆمەڵایەتی و هەمیسان بۆ ئەوین. من بێ‌ئەوەی هەوڵ بدەم لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی شیعرەکانی زەق بکەمەوە و لە ئەنجامدا وەک شاعیرێکی بەرپرسی بناسێنم، ئەو راستییە لە خوێنەر ناشارمەوە کە وەفا لە شیعرەکانیدا ـ وەک ژیانی رۆژانەی ـ مرۆڤێکی ئەویندارە. ئەوین پاڵنەر و بزوێنەر، و لە زۆر قۆناغی ژیانیدا چرای ڕێنومای ژیانیەتی. ئەگەر ئەوین لە شیعری وەفا جیا بکرێتەوە، تەنیا هەندێک یاری کردن بە وشەی لێ دەمێنێتەوە و نیشان و مۆرکی هەستی ئەویان پێوە نامێنێت.

وەفا لە دەربڕینی ئەوینەکەیدا، گەلێک جار شێوازی شاعیرانی تر ڕەچاو دەکات و لە بڕگەی جیاوازی ژیانیدا ئەم شێوازانە دەگۆڕێت واتە لە شاعیرانی کلاسیکی فارسییەوە دەگاتە نیما و شاملوو و فروغ و سپێهری و ئەوانی‌تر، یا لە گۆرانەوە بۆ عەبدوڵڵا پەشێو و شێرکۆ بێکەس. بەڵام دوای هەموو ئەو ڕێگە بڕینانە، ڕێبازێک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە کە تایبەت بە خۆیەتی. چوارینەکانی وەفا نموونەی ئەو ڕێچکە سەربەخۆیەن. خالیس و موخلیس بوون لە ئەویندا گەوهەری هەموو چوارینەکانی وەفان و عەشق ڕۆحێکە بە بەژنیاندا هەڵکشاوە. ناسیاوی شیعری وەفا بە بیستنی چوارینەکان، دەیانناسێتەوە و دەزانێ کێ گوتوونی. من بە خوێندنەوەی چوارینەکانی وەفا دەکەومە یادی بابە تاهیری هەمەدانی و شاعیری فارس "فائیز دەشتستانی"؛ ساکاریی ئەندێشە و پاکی و دڵسافی و لە خۆبوردوویی بۆ ئەوین و بۆ گراویی لە شیعری هەر سێ ئەو کەسانەدا بابەتی سەرەکییە.

باسی ئەم ساکاریی ئەندێشەیە، دەمکێشێتە سەر مەسەلەی "زمان" و شێوازی دەربڕین لە شیعری وەفادا. زمانی شیعرە فارسییەکانی وەفا لەوپەڕی جوانی و ڕازاوەییدایە. دوکتۆر محەمەدڕەزا شەفیعی کەدکەنی ـ شاعیر و ئەدیبی ناسراوی ئێرانی ـ لەم بارەیەوە دەڵێ:

*"ئەوە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە خوێنەری شیعری فارسی وەفا هەرگیز هەست بەوە ناکات شاعیرەکەی فارس نەبێت و زمانی زگماکی شتێکی دیکە بێت. من لە شیعرە فارسییەکاندا نە وشەی بێ‌ڕێوجێم بینیوە و نە بارودۆخێک کە شاعیر لە ژێر گوشاری وشە و دەربڕیندا مەجبوور بووبێت ناوەڕۆک قوربانی بکات یا بیرۆکەی ناو شیعرەکە ناتەواو بهێڵێتەوە. وەفا بەو ڕەوانی*

*و ڕێکوپێکییەی قسەی ئاسایی بکات، شیعرەکانی هۆندوونەتەوە و لە سەرجەمی کۆمەڵە شیعری "سرود پرستو"دا ـ چ لە شیعری کلاسیک، چ نوێ و چ سپی- زمانی دەربڕین و دەستەوشەی بەکارهاتووی لەوپەڕی سەرکەوتووییدان.*[١]

شیعرە کوردییەکانیش لەو یاسایە بەدەر نین. وەفا گەلێک درەنگ لە گەڵ شیعری شاعیرانی باشووردا ناسیاوی پەیدا کرد. سەرمەشق و نموونەی شیعریی بۆ شیعرە کوردییەکانی پێش هەموو شت فۆلکلۆری ناوچەکە و بۆ نموونە گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک بوون. کێشی شیعرە سەرەتاییەکانیشی ئەو ڕاستییە وەدەر دەخەن:

*"بۆ پێشەوە جووتبەندە*
*دنیا بە تۆوە بەندە. . . ."*

لە ڕاستیدا وەفا کوردی پەتی و زمانی گوندنشینانی نەدەزانی و هیچ ناسیاوییەکی لەگەڵ زاراوەی کشتوکاڵی و ئاژەڵداریی و ژیانی خێڵەکیدا نەبوو، هیچ کام لەوانەش لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان نەداوەتەوە. وەفا لە ڕۆژنامەگەریی کوردی و چاپەمەنییەکانی باشووری کوردستانیش دوور بوو و لە ئەنجامدا ئەوەی بۆی مابۆوە زمانی "فارسی لێدراو"ی شارۆچکەکەی بوو ـ کە بۆکان بێت. ئەم کێشەیە لە شیعری عەلی حەسەنیانی (هاوار)یشدا بەرچاوە. کەسێکی وەک سوارە حیسابی جیاواز بوو، ئەو لە ناو عەشیرەتەکەیاندا و لە گوندی قەرەگوێزی لای بۆکان گەورە ببوو و گەلێک زیاتر لەوان

---

[١] بڕوانە وتاري کاک هادي حەبیبي

دەستی بە چاپەمەنی و کتێب و نووسراوەی باشووری کوردستان رادەگەیشت و بۆ چارەسەری هەر ئەم کێشەیە، تەنانەت هەندێک جار بە شێوەی میکانیکی کەڵکی لە دەستەوشەی کرمانجی ژووروو وەردەگرت. هەندێ وشەی نامۆی ناو شیعری "خەوەبەردینە" هەر ئەو وشە و زاراوانەن وا هەژاری موکریانی لە مەم و زینە سۆرانییەکەی خۆیدا هێناونی؛ جا هەژار بە شێوەیەکی سروشتی، کە بە هۆی ژیان لە "تربەسپی" و "جزیر" و هەروەها لە سەردەمی وەرسووڕاندنی مەموزین لە زاراوەیەکەوە بۆ ئەوی‌تر، فێری وشە و زاراوەکان ببوو و کەڵکی لێ‌وەرگرتبوون، لە کاتێکدا سوارە تەنیا بە حیسابی شعووری نەتەواویەتی و هەوڵدان بۆ "پیوریزم" و هەڵوەدا بوونی کوردیی پەتی، لەو یا لە کەسانی دیکەی خواستبوونەوە.

وەفا ـ بە بۆچوونی من ـ لای کەم لەو سەردەمەدا هەڵگری بیری کوردایەتی سوارە و چاوە نەبوو. بۆ ئەو، روو کردنە شیعری کوردی زیاتر لە پەیوەندییەکی چینایەتی و دژایەتی ئاغاوات و شادی دەربڕین بۆ دەسەڵات پەیدا کردنی وەرزێڕان هاتە کایەوە، نەک لە پەیوەندی کوردایەتی و کێشەی نەتەوەییدا. شیعرە سەرەتاییەکانی ناو رۆژنامەی کوردستانیشی ئەو راستییە دەردەخەن: ئەو بە تەنگی کێشەی وەرزێڕ و ئاغاوەیە نەک کورد و عەجەم! هەر ئەو دیاردەیەش شوێن دادەنێتە سەر "زمان"ی دەربڕین و شیعر گوتنی ـ زمانێک کە "بەرگۆ"کەی خەڵکانی ئاسایی گوندنشینی ناوچەکەن، نەک ئیلیت و رووناکبیرانی خوێندەوار، هەر بۆیەش ساکار و بێ‌گرێ و گۆڵ و لەبەردڵانن. بە پێچەوانە، شیعری ئەم ساڵانەی دوایی وەفا ـ واهەیە لە ژێر کارتێکەریی شێرکۆ بێکەس و زمانی "فەخیم"ی ئەودا،

دارماڵی وێنە و ئیستیعارە و شوبهاندنی شیعرین. بەڵام ئاشکرایە ئەم کارە بە شێوەیەکی میکانیکی کراوە و شاعیر بۆ ئەم قەرز وەرگرتن و خواستنەوەی شێوازە، زمانی پڕ بە پێستی شیعریی خۆی بەجێ هێشتووە و سوودی لە زاراوە و دەستەوشەی نامۆ وەرگرتووە ـ نامۆ بۆ خۆی، نامۆ بۆ شیعری ناسراو بە شیعری "وەفا" و لە ئەنجامدا نامۆ بۆ خوێنەر!

لە باری ناوەرۆکەوە، شیعری وەفا چەند قۆناغی بڕیوە. شیعرە فارسییەکانی زۆربەی زۆریان ئەویندارین و هەندێ جار کۆمەڵایەتی‌سیاسین. شیعری کوردی وەفا بە شیعری سیاسی دەست پێ‌کرد، ئەویش لە سەردەمی "ئیسلاحاتی ئەرزی" رژیمی شا و بێدەسەڵات بوونی ئاغا و خاوەن ملّک لە ساڵانی دەیەی چل (شەستی زایینی). بەڵام ئەوین بەرگێک نەبوو لەبەر شیعری وەفا بکرێت و دەربێت. ئەوین تان‌وپۆی شیعر و تەنانەت ژیانی شاعیرەکەش بوو، هەر بۆیەش گەلێک زوو ـ هەر دوای سارد بوونەوەی کوڵ‌وکۆی ئیسلاحاتی ئەرزی و دەرکەوتنی راستەقینەی رژیم لە پشت پەردەی ئەو ئیسلاحاتەوە، وەفا گەڕایەوە دۆخی ئاسایی خۆی و چووەوە جێ‌ژوانی عەشق و دەستەملانی پەری شیعری ئەوینداری بووەوە. شیعری نێوان ساڵانی ١٣٤٣ (١٩٦٤) و سەردەمی شۆڕشی گەلانی ئێران (١٣٥٧=١٩٧٩) بە گشتی شیعری غەرامین.

لەو قۆناغە و چەند ساڵ دوای ئەویشدا، هەمیسان سیاسەت بەرۆکی دەگرێت و لە خەڵوەی ئەوین دەری دەکات، بەڵام سەر لەنوێ گەڕانەوەیە بۆ دونیای دڵداری و خۆشەویستی و بۆ

پەردەخانەی عەشق ـ شوێنێک کە تێیدا ئۆقرە دەگرێت، هێور دەبێتەوە و دەتوانێ شیعری دڵی بڵێت.

من لەوە زیاتر لە سەر مەسەلەکە ناڕۆم، لەبەر ئەوەی بڕیارە لە بەشی پاشکۆی هەر ئەم کتێبەدا چەند وتاری مامۆستایان و پسپۆڕان سەبارەت بە شیعری وەفا و ژیان و کەسایەتی و سەردەمی شاعیر بڵاو ببنەوە.

وەفا لە باری شەخسییەوە کەسێکە من زیاد لە برایەک پێی قەرزدارم و ئەم هەستەم بە دڵنیایی لەم دێڕانەدا رەنگی داوەتەوە، گەرچی هەموو هەوڵی خۆم داوە بێلایەن بمێنمەوە و هەستم بە سەر مەنتیق و راستەقینەی دەرەوەی زەینمدا زاڵ نەبێت، بەڵام باش وایە خوێنەر ئاگاداری ئەو نزیکایەتییەی من لە وەفا بێت.

❊❊❊

سەبارەت بەم کتێبە هەندێ روون کردنەوە پێویستە:

وەفا گەلێک خەتخۆش بوو و لە ساڵانی کۆتایی ژیانیدا سەرجەمی شیعرەکانی خۆی و ئەو وتارەی کە لە سەرەتای شیعرەکان و دوای ئەم وتارە دەیخوێننەوە، کە بەختەوەرانە بە هیممەتي هێرش گیاني کوڕي و زەحمەتي هێندێ لە دڵسۆزان بە بێ کەم و زۆر، هاوڕێ لەگەڵ هەندێ بیرەوەری سەبارەت بە حەسەن زیرەک و بابەتی هاوچەشن نووسیبووەوە و بە ئامادەیی داینابوون بۆ چاپ، هەموویان تایپ و ئامادەی چاپ کراون و من لێرەدا سپاسي هەردوولایان دەکەم.

سەبارەت بە ناوی کتێبەکە دەبێ بڵێم وەفا خۆی ناوێکی بۆ دەستنیشان نەکردبوو، بەڵام لە ماوەی نەخۆشییەکەیدا یەک لە منداڵەکانی بە تەلەفون لە دەرەوەی وڵاتەوە پرسیاری لێ کردبوو و ئەویش بە شێوەیەک توانیبووی بڵێ "چەپکێ گوڵ". بارودۆخی سەلامەتی وەفا بۆ ئەوە نەدەبوو وەبیری بهێنرێتەوە کە ئەو ناوە پێشتر بۆ کۆمەڵە شیعری نەمر "شامی کرماشانی" دانراوە - گەرچی ئەو شیعری شامی دەناسی، بەڵام کاتی ئەو روون کردنەوانە نەمابوو و ئێمە بۆ رێز گرتن لە بۆچوونی خاوەن شیعرەکان دەبوایە بە قسەمان بکردایە.

گەرچی وا هەبووە بە گوێرەی ناوەرۆکی شیعرەکان بیر لە هەندێ ناوی دیکە بکرایەتەوە، بەڵام ئێمە رێگایەکمان هەڵبژارد کە هەم خواستی وەفای تێدا بەجێ هاتبێت و هەم گرفتێکی لەگەڵ ناوی کۆمەڵە شیعری شامی پێک نەهێنابێت: وشەکانمان هەندێک پێچا و بامان‌دا و کردمان بە "چەپکێک لە گوڵ". هیوایە کارەکەمان بە دڵی وەفا بێت و بۆ ئەم گۆڕانکارییە، دڵی ناسکی لێمان نەڕەنجێت.

وەفا شیعرەکانی خۆی بەم شێوەیە رێکخستوون:

١- شیعری نوێ

٢- شیعری عەرووزی

٣- چوارینە

و لە بەشی یەکەمدا شیعری بێ‌سەروای لەگەڵ پەخشانە شیعردا تۆمار کردوە.

باشترین شێوەی بڵاو کردنەوەی شیعرەکان ئەوە دەبوو کە بمتوانیایە هەموویان بە گوێرەی رێکەوتی گوتنیان رێکبخەم. بە داخەوە هەموو شیعرەکان رێکەوتیان بۆ دیاری نەکراون و لە

ئەنجامدا ئەم کارە لە کردن نەدەهات. باشترین هەڵبژاردنی دوای ئەو، دابەش‌کردنی شیعرەکان دەبوو بە گوێرەی بابەت و شێوە، کە هەر ئەم شێوازەشم ڕەچاو کردووە. واتە سەرەتا شیعرە نوێیەکانم لە شیعری عەرووزی و چوارینە جیا کردەوە، ئینجا بە گوێرەی بابەت کردوومن بە سێ بەشەوە:

*«من»* ـ ئەو شیعرانەن وا شاعیر سەبارەت بە خۆی و ژیان و هەڵوێستی خۆی گوتوون؛
*«ئەو»* ـ شیعری ئەوینداری؛ و
*«ئەوان»* ـ شیعری سەبارەت بە وڵات، کۆمەڵگا، و سیاسەت.

ئینجا لە بەشی دواتردا، چوارینەکانم هێناون، دوای ئەوان شیعرە عەرووزییەکان و لە کۆتاییشدا پەخشانە شیعرەکان.
بەڵام جگە لەو شیعرانەی کە وەفا خۆی گردوکۆی کردبوون، لە ناو نوسخەکانی ڕۆژنامەی کوردستانی چاپی تاراندا، یازدە پارچە شیعریم دۆزییەوە و بە دوای شیعرە عەرووزییەکاندا هێنامن. بەم پێیە سەرجەمی شیعرەکان لە حەوت بەشدا ڕێکخراون.

لەمەڕ *پاشکۆ* دەبێ بڵێم: دوا بە دوای کۆچی دوایی وەفا، کۆبوونەوەی یادەوەری لە مزگەوتێکی بۆکان و ئینجا کۆڕێکی ڕێزگرتن لە لەندەن بەڕێوە چوو و بە شوێنیدا، گۆڤاری "مەڵبەند" چاپی مەڵبەندی ڕۆشنبیری کورد لە لەندەن ژمارەیەکی تایبەت بە وەفای دەرکرد. کۆی ئەو وتارانەی وا لەو شوێنانە پێشکەش کران و بڵاو بوونەوە، هاوڕێ لەگەڵ چەند وتار کە ڕۆژنامەی ئاسۆی

سلێمانی لە یەکەمین ساڵوەگەڕی کۆچی دوایی وەفادا بڵاوی کردەوە، هەموویانم لە بەشی پاشکۆی کتێبەکەدا هێناون. هەڵسەنگاندنی جۆربەجۆر و روانینی هەمە لایەنەی ژیان و شیعری وەفا لەم وتارانەدا دەخرێنە بەرچاوی خوێنەر بۆ ئەوەی پێوانەیەک بۆ ناسین و هەڵسەنگاندنی کارەکانی بە دەستەوە بێت، هاوڕێ لەگەڵ وتارەکان هەندێک پەیام و راگەیاندنی کەسایەتی ئەدەبی و شاعیرانی کورد بە بۆنەی کۆچی دوایی وەفا دەهێنم و هەروەها ئەو کۆڕەی وا بە بۆنەی ساڵوەگەڕی کۆچی دوایی وەفاوە پارتی ئازادی کوردستان لە باشووری کوردستان رێکی خستبوو و تێیدا وتار و پەیام راگەیێنرابوو.

لە بەشێکی کتێبەکەشدا سێ تابلۆی نەققاشی چاپ دەکرێن کە دوانیان هونەرمەندی ناوداری کورد کاک ناسری قازیزادە و ئەویتریان هونەرمەندی بەڕێز کاک سەلاحی خوسرەوی کێشاویانە. هەر سێ کارەکە، دوای مەرگی وەفا بەرهەم هاتوون و بە گوێرەی پەسندی بنکەی بڵاوکەرەوەی کتێبەکە، لە شوێنی پێویست دادەنرێن.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم سپاسی هەموو ئەو زاتانە بکەم کە لە سەردەمی نەخۆشی وەفادا خزمەتیان کرد، سەریان دا، عیلاج و پەرستارییان کرد و لە مەرگیدا رێزیان لێگرت، دڵدانەوەی کەسوکاریان کرد و لە کۆڕی یادەوەرییدا بەشدارییان کرد یاخود وتاریان لەسەر نووسی و پەیامیان نارد. ناو هێنانی هەموو ئەو کەسانە لە گونجان نایەت و ناو بردە کردنی تاقمێک و پشت گوێ خستنی هەندێکیش، کارێکی بەجێ نییە، هەر بۆیەش خۆم لە ناو هێنان دەپارێزم و تەنیا ئەوە دەڵێم گەورەیی نواندنی تێوە بۆ رێز

گرتن لە هونەری وەفا، لە پێناو وشەی کوردیدا بووە؛ بەم کارە ئاوڕتان لە کەسێک داوەتەوە کە لە رادەی خۆیدا خزمەتی گەلەکەمانی کردوە، لە وەرچەرخانی شیعری کلاسیکی کوردی بۆ قۆناغی نوێدا دەوری گرنگی بینیوە و لە پێناو گەلەکەی رەنجی کێشاوە. کۆمەڵانی خەڵکیش پێزانی خزمەتەکانی بوون و رێزیان لێگرتووە، ئەوەش بۆ هونەرمەند بەسە! هەژار گوتەنی:

*نیشتمان هەر کەسێ بۆی بمرێ، نەمرد*
*لەشی سەر دۆشە کە هیچ بەهری نەبرد*

# کرۆنۆلۆجیای ژیانی وەفا

١٩٣٩ (*١٣١٨ی هەتاوی*): لە بۆکان دێتە جیهان

١٩٤٥ (١٣٢٤) سەردەمی کۆماری کوردستان دەچێتە قوتابخانە

١٩٥١ (١٣٣٠) بە هۆی تەنگژەی ناسنامەوە مۆڵەتی خوێندنی ناوەندی پێنادرێت و قوتابخانە بە جێ دێڵێت.

١٩٥٢ (١٣٣١) دووکانی خەڕازی (جەمالیات) دادەنێت، سەرناکەوێت.

١٩٥٣ (١٣٣٢) **یەکەم** دووکانی سەربەخۆی رۆژنامەفرۆشی لە بۆکان دەکاتەوە، دوا بە دوای کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژ دژ بە حکوومەتی میللی دوکتۆر موسەددیق دەگیرێت و لە مەهاباد زیندانی دەکرێت.

١٩٥٣ (١٣٣٢) **یەکەم** شیعری نوێی رۆژهەڵاتی کوردستان دەڵێت، بەڵام بە فارسی.

١٩٥٣ (١٣٣٢) بە هۆی کێشەی تەمەنی کەمەوە بە مەرج لە زیندان ئازاد دەکرێت و بۆ ماوەی ١٥ ساڵ لە ژێر لێپرسینەوەی دادگای نیزامیدا دەمێنێتەوە.

١٩٥٤ (١٣٣٣) دووکانی شیرینیات و بەستەنی و پاڵوودە دەکاتەوە.

١٩٥٧ (١٣٣٦) ***یەکەم*** دووکانی سەربەخۆی کتێبفرۆشی بۆکان دەکاتەوە.

١٩٥٨ تا ١٩٦٣ (*١٣٣٧ تا ١٣٤٢*) شیعرە فارسییەکانی لە گۆڤارەکانی چاپی تاران (امید ایران، تهران مصور، آسیای جوان و...)دا بڵاو دەبنەوە.

١٩٦٠ (١٣٣٩) سەربازی لە مەهاباد. بەرپرسیارێتیی بەشی ئەدبی لە رادیۆی سوپایی مەهابادی پێدەدرێت.

١٩٦٢ (١٣٤١) دەگەڕێتەوە بۆ بۆکان و دەچێتەوە سەر کاری کتێب و رۆژنامە فرۆشی

١٩٦٢ (١٣٤١) کۆمەڵە شیعرە فارسییەکانی بە ناوی "سرود پرستو" (سرروودی پەڕەسێلکە) لە تاران بڵاو دەبێتەوە.

١٩٦٢ (١٣٤١) لە کێبەرکێی شیعریی رادیۆی فارسی دیهلیدا پلەی ***یەکەم*** دێنێتەوە و لە رێورەسمێکی باڵوێزخانەی هیندستان لە تاران، لە لایەن دوکتۆر سەدیق ئەعلەم وەزیری فەرهەنگی ئێرانەوە ٥ بەرگ کتێبی ئیمزا کراوی جەواهیر لەعل نەهرۆی خەڵات دەکرێت.

١٩٦٢ (١٣٤١) هاوسەری ژیان دەگرێت.

١٩٦٣ (١٣٤٢) دەبێتە باوکی یەکەم منداڵی.

١٩٦٤ تا ١٩٧٩ (١٣٤٣ *تا* ١٣٥٨) دووکانی کەرەسەی ماڵ دەکاتەوە. دواتر دووکانەکەی دەکاتە ترۆمبیل فرۆشی.

١٩٨٠ (١٣٥٩) بە ماڵەوە دەچێتە شاری ورمێ و لەوێ دووکانی بووتیک دەکاتەوە.

١٩٨١ (١٣٦٠) ماڵی دەچێتە کەرەج (گەوهەردەشت) و لە بازاری تاران دووکان دەکاتەوە.

١٩٨٢ (١٣٦١) ماڵی دەچێتە تاران و خەریکی کاروکاسبیی جیاجیا دەبێت.

١٩٩٥ (١٣٧٤) لەگەڵ هاوسەریدا بە ٦ منداڵەوە دەگەڕێنەوە بۆکان.

١٩٩٦ (١٣٧٥) دووکانی پیزە (پیتزافرۆشی) لە بۆکان دەکاتەوە و خواردەمەنیی کوردییش دەفرۆشێت.

٢٠٠٤ (١٣٨٣) لە لەندەن و پاشان لە تاران عەمەلیاتی دڵی دەکەن و تووشی نارەحەتی دێت.

٢٠٠٥ (١٣٨٤) بۆ جاری دووهەم تووشی سەکتەی مێشک(جەڵدە) دێت و لە جێگەدا دەکەوێت.

٢٠٠٥/١١/٢٢ (١٣٨٤/٩/١) لە ماڵی خۆی لە بۆکان ماڵئاوایی لە جیهان دەکات و هەرلەوێ دەنێژرێت.

# سەرەتای نوێخوازی
# و
# سەرهەڵدانی شیعری نوێ

# لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان

عومەر سوڵتانی "وەفا"

زۆرجاران داوایان لێکردووم سەبارەت بە سەرهەڵدانی شیعری نوێ و ڕەوتی سەرەتاکانی بزووتنەوەی نوێخوازی لە شیعری ڕۆژهەڵاتی کوردستان بابەت بنووسم و بیرەوەرییەکانی ئەو سەردەمە شی بکەمەوە، بەڵام هەمیشە لە بەرانبەر ئەو داخوازییانەدا وەستاوم؛ لەبەر ئەوەی قەت پێمخۆش نەبووە ـ بە کەم و کورتیش بێت ـ باسێک لە خۆم بکەم و خۆم بکەمە تەوەر یا تەنانەت بەشێک لە مەسەلەکە. هەر چۆنێک بێ، ئەو قۆناغە ئێستا بەشێک لە مێژووە و من نە دەتوانم و نە دەمەوێ بیگۆڕم یا بیشێوێنم.

ئەم چەند لاپەڕەیە، بیرەوەری منە لەو ڕۆژانەی کە بیری گۆڕانکاری و نوێ کردنەوەی شیعر لە ئوروپاوە گەیشتبووە تورکیا

و لەوێوە بۆ ئێران و عێراق. من نازانم ئەو گۆڕانکارییانە چەندە پێداویستیی زە مان و زەرووڕەتی شیعری کوردی و کۆمەڵگای کوردەواری، یا چەندە کالایەکی واریداتی بوو کە لە دەرەوە هاتبووە ناو کۆمەڵگاکەمانەوە؟ ئەم هەویرە ئاوی زۆر هەڵدەگرێت.

گۆڕان حوکمێکە بە سەر هەموو دیاردەیەکدا زاڵە و هەموو شتێکی ئەم جیهانە هەموو دەم لە گۆڕاندایە، شیعری کوردیش لە ڕابردوودا گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە: لە شیعری بڕگەیی "بەیت"ەوە بووە بە شیعری عەرووزی و لە شیعری ساکاری ئاییینی "یارسان"ەوە بووە بە شیعری قورس و ئاڵۆزی مەلای جەزیری؛ لە هەڵبەستی عاتیفی حەزرەتی "نالی"یەوە بووە بە شیعری بەرپرسی هەژار و هێمن و جگەرخوێن.

گۆڕانی شیعری کوردی و تێپەڕ کردنی قۆناغی بڕگەیی و گەیشتن بە قۆناغی عەرووزی، بە بێ هیچ گومانێک لە ژێر شوێندانانی دیاردەیەکی لاوەکی، واتە شیعر و زمانی عەڕەبیدا هاتە گۆڕێ.

تێپەڕ کردنی قۆناغی عەرووزی و چوونە نێو قۆناغێکەوە کە بە شیعری "نوێ" ناو دەبرێت بە هەمان شێوە لەژێر تەئسیری ناڕاستەوخۆی شیعری ئوروپایی و شوێندانانی ڕاستەوخۆی شیعری تورکی و فارسی و عەڕەبیدا بوو، کە ئەوانیش خۆیان بە ماوەیەکی کەم پێش ئێمە هەمان شوێنیان لە شیعری ئورووپایی هەڵگرتبوو. وەڵامی ئەوەی کە شیعری ئورووپایی خۆی لەژێر چ پێداویستییەکدا شیعری کۆن و قافیەداری بەجێ هێشت و شیعری نوێی کردە جێگری ئەو، لە وزەی مندا نییە و لێی نازانم.

هەر چۆنێک بێت، شیعری کوردی لەژێر تەئسیری نوێخوازانی تورک و عەرەبدا لە باشووری کوردستان لە لایەن گۆران و شێخ نووری شێخ ساڵح و محەمەد ساڵح دیلان ڕچەی بۆ شکا. بنەمای ئەم کارە لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا ڕژا، بەڵام هەوڵی پێشەنگەکانی نوێخوازی لە پەنجاکاندا چرۆی کرد و دەرکەوت.

ئەم گۆڕانکارییانە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان چەند ساڵێک دواتر ڕووی دا و هۆی ئەم درەنگ کەوتنەش تا ڕادەیەک ڕووناکە، لە ڕۆژهەڵات دەرەتانی سیاسی و ئازادی نووسین و بڵاو کردنەوەی شیعر، یا هەر نەبوو یا ئەگەر بوو کەمتر بوو، هۆیەکی تری ئەم دوا کەوتنە وا هەیە لەوەدا بدۆزەوە کە شیعری کوردیی ڕۆژهەڵات، ڕاستەوخۆ لە ژێر تەئسیری شیعری فارسیدا قاڵبی کۆنی شکاند، کە شیعری فارسیش هەموومان دەزانین چەند ساڵێک دوای شیعری تورکی ـ چ لە تورکیا و چ لە ئازەربایجانی باکوور ـ لەگەڵ مەسەلەکەدا ناسیاویی پەیدا کردبوو، لە کاتێکدا پێشڕەوانی شیعری نوێ لە باشوور، هەر هەموویان ناسیاوی شیعری تورکی بوون و ڕاستەوخۆ بەرامەی ئەو فەزا نوێیەیان لەوێ هەڵمژیبوو.

خاڵی هەرە گرنگ لە پەیوەندی ئەو گۆڕانکارییانەدا ئەوەیە کە نوێ بوونەوە و شکانی قاڵبی عەرووزی ئەگەر بۆ تورک و فارس و عەرەب دیاردەیەکی نامۆ بوو، بۆ کورد وا نەبوو؛ بەڵکوو گەڕانەوەیەک بوو بۆ بنەما، ئێمە لە زووەوە خوومان بە شیعری بڕگەیی گرتبوو کە شێوە و شێوازی لە شیعری نوێ گەلێک نزیکتر بوو تا شیعری عەرووزی، و هەتا ئەو سەردەمانەش بە سەر زمانی خەڵکەوە مابوو؛ واتە شیعری قاڵب شکاوی کێشدار و بێقافیە، لە

کوردەواریدا زیاتر لە گەلانی دراوسێ دەیتوانی جێگەی خۆی بکاتەوە و هەر واش بوو.

بۆ من شیعری نوێی فارسی دەروازەیەکی نوێ بوو بۆ جیهانێکی نوێ، من شارەزاییەکی کەم تا کورتم لە شیعری کلاسیکی فارسی هەبوو، بەشێکیانم بە دەرس لە ساڵەکانی ١٣٢٤و ١٣٢٥ خوێندبوو. لە ڕێگەی شیعری کۆمەڵایەتی ـ سیاسی کەسانێکی وەک "لاهووتی کرماشانی" و "ئەبوو توراِبی جەلی" و "پیرۆزی کەلانتەری"یشەوە ئامادەییم بۆ وەرگرتنی دیاردەی نوێی شیعری تازە هەبوو، چ بۆ ناوەرۆک و چ بۆ فۆرم، هەر ئەوەندە کە کەمکەم چوومە نێو شیعرەکانی نیمایووشیج و شاملوو، بوومە هۆگریان و لە سەر شێوازی شیعری نوێ کەوتمە شیعر کوتن، واتە دارە دارەم بە شیعری نیمایی کرد و ئەویش دیارە بە زمانی فارسی.

ئەو دەم لە بۆکان و لە شارەکانی دەوروبەریش نەمبیستبوو کەس شیعری نوێ بڵێت و بڵاو بوونەوەی شیعرە فارسیەکانیشم لە گۆڤارەکانی چاپی تاراندا بۆ ناوچەکە گەلێک نوێ و نائاسایی بوو، هەر بۆیەش زۆر زوو ناوم دەرکرد و لە کۆڕ و مەجلیسدا باسم دەکرا.

لە بۆکانی ئەو ساڵانەدا کە تازە چەند ساڵێک بوو کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژ سەرکەوتبوو، کۆمەڵانی خەڵک لە ژێر زەخت و زۆری دەرەبەگەکاندا بە شێوەیەکی دوو لایەنە دەچەوسانەوە، دەرەتانێک بۆ خوێندنەوەی شیعری کوردی و نووسین بە زمانی کوردی تەنانەت بە شێوەیەکی شەخسی و نیانیش نەبوو و هەر حەمەدەمینی مەحموودئاغا بیبیستایە، بەس بوو! وا هەبوو ئەو دەرەتانە لە

گوندەكاندا زیاتر بێت چون سێبەری حەمەدەمین دیار نەبوو. دێهاتیش لەچاو شار كەمتر جێگەی تەڕاتێنی مەئموورانی حكومەتی بوو و زۆربەی شیعری كوردیش بەم بۆنەیەوە لە گوندەكان دەگوترا و دەنووسراوە.

لە تارانیش لە چاو شارەكانی تری ئێران و بەتایبەت شارە چكۆلەكانی وەک بۆكان، ئازادی زیاتر هەبوو و ئەو ئازادییە لە ناو زانستگەكاندا گەلێک زیاتر بوو، لەڕاستیدا زانستگەی تاران لە ساڵانی ڕەشی دوای كۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژدا ببووە سەنگەری ئازادیخوازی و خەبات.

لە زانستگەی تاران چەند خوێندكارێكی خوێن گەرم و لێزانی كورد دەرسیان دەخوێند كە زیاتر لە بیری خاک و گەلەكەیاندا بوون تا دەرس خوێندن. لە نێو ئەوانەدا كاک ئەمیری حەسەنپوور، كاک سوارە ئیلخانیزادە و كاک عەلی حەسەنیانیی نەمر و هەروەها كاک فاتح شێخولئیسلامی "چاوە" و كاک سەلاحی موهتەدی و چەند كەسێكیتر بوون ، ئەو پیاو چاكانە كەم و زۆر هاتوچۆی یەكتریان دەكرد و هەروەها جارجاریش لە ماڵی حاجی ڕەحمانئاغای موهتەدی كۆ دەبوونەوە كە لە بۆكانەوە چووبووە تاران و لە زانكۆی مەعقوول و مەنقوولی دانشگای تاران دەرسی دەگوتەوە. ماڵی حاج رەحمانئاغا ڕۆژانی هەینی دەبووە كۆڕی شیعر خوێندنەوەی كوردی و هەروەها باسی كۆمەڵایەتی و سیاسی چیرۆكی وە ک "نان و فیشەک" و زۆر ئاسەواری ئەدەبی دەخوێنرانەوە. لەو سەردەمەدا شتی باش دەكوتران و دەنووسران.

كتێب و چاپەمەنی باشووری كوردستان زۆر بە چاكی دەگەیشتنە نێو ئەو كوڕانە و لاوە دڵسۆزەكان دەیانخوێندنەوە و لە ڕێگەی ئەو

چاپـەمـەنیانـەوە شـیعری نـوێی کـوردی بـەر گـوێی لاوان دەکـەوت و زۆرێک "گۆران"ی نەمریان دەناسی.

چەند ساڵێک دواتر ڕۆژنامەی کوردستان کە لە تاران دەردەچوو، لە شارەکانی کوردستانیش پەرەی گرت و دەورێکی باشی لە هاندانی لاوانی کورد بۆ خوێندنەوەی زمانی کوردی بینی، ئەوەش سەرەڕای ئەو ڕاستییە ی کە ڕۆژنامەی کوردستان لەژێر چاوەدێری دەوڵـەتدا بەڕێوە دەبرا.

لـەگـەڵ ئـەو چـاوەدێرییـەشـدا، بـە هـۆی نییـەتـی پـاک و ئامـانجی خزمەتگوزارانی سەرنووسەر و دەستەی نووسەران، گەلێک بابەتی پێشکەوتنخوازانە و بیری نەتەوایەتی کوردی لە لاپەڕەکانیدا ڕەنگیان دەداوە، بـۆ نموونـە بـە بۆنـەی کـۆچی دوایـی "گـۆران"ی نـەمـرەوە ژمارەیەکی تایبەتی ڕۆژنامەکە بڵاو کرایەوە کە وتارە سـەرەکیـەکەی لەمەڕ گۆران، کاک ئەمیری حەسەنپوور نووسیبووی.

ئەم دیاردانە و لە ژوور هەموانیشـەوە ئازادییـەکی نیسبی بۆ بیر کردنـەوە و خوێندن و نووسـین، بوونـە هـۆی سـەرهـەڵدانی شـیعری نوێی کوردی لـە تاران، لـە کاتێکدا من لـە بۆکـان جگـە لـە ڕۆژنامـەی کورستان هیچ بابـەتێکی تری کوردیم وە بـەر چاو نـەدەکـەوت و لـە ڕاستیدا نـەفـەسـم لـە فـەزای شـیعری نـوێی فارسـیدا دەکێشـا، نـەک لـە شیعری نوێی کوردی؛ بـەڵام هـەر چۆنێک بێ پێ بـە پێـی ئـەوان ـ و ئەگەر بە خۆهەڵکێشان نەبێ ـ لەپێش ئەواندا *چەمکی نوێخوازیم هێنایە ناوچەکەوە،* دیـارە بـە زمـانی فارسـی. بـەڵام زمـان، قاڵبێـک زیـاتر نییـە و بیـر و چەمکە، کە ناوەرۆک و گەوهەرن.

من نازانم یەکەم شیعری کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کامەیە و کێ گوتوویە، بەڵام هیچ دژایەتییەکیشم لەگەڵ ئەو بۆچوونە نییە کە یەکەم شیعری کوردی ڕۆژهەڵات "جەللاد"ی کاک عەلی حەسەنیانی بووبێت، ئەوەی دەتوانم بیڵێم ئەوەیە کە شیعری من ـ دیارە بە فارسی ــ لە پێش ئەو شیعرە و شیعری سوارەی نەمر و هەرکەسێکی‌تردا گوتراوە، بەڵام درەنگتر بڵاو کرایەوە، من بەهۆی دۆستایەتی و نزیکایەتیی کاک عەلی حەسەنیانی و کاک سوارە وە دەستم بە گوتنی شیعری کوردی کرد، چونکە دۆستایەتیەکی یەکجار زۆرم لەگەڵ ئەو دوو نەمرانە هەبوو.

کاک سوار لە گەڕانەوەی بۆکانیدا نەک جار و دوو جار، بەڵکوو بە شێوەی ڕۆژانە سەردانی دووکانە کتێب فرۆشییەکەمی دەکرد و کاک عەلی حەسەنیانیش لە مەهابادەوە و بەتایبەت لەو ماوەیەدا کە لە شاری میاندواو ئیشی دەکرد، زۆر جار دەهاتە بۆکان و کەم جار وا بوو سەردانی من نەکات و یەک دوو شیعرم بۆ نەخوێنێتەوە.

ئێمە دۆستی نزیکی یەکتر بووین و ئێستا،کە ئەوان بە داخەوە سەریان ناوەتەوە، ڕێزی ئەو دۆستایەتییە هەر دەگرم و هەوڵیشم ئەوە نییە حەقی ئەوان بکەمە ناحەق و یاخود ببمە تەشوێ و بۆ لای خۆمی داتاشم. بە ڕاشکاوی دەڵێم ئەگەر تەئسیری ئەوان و هەروەها کاک فاتیحی شێخولئیسلامی نەبوایە، وا هەبوو هەرگیز بۆ لای شیعری کوردی نەچم. کە وا بوو بۆ هەمیشە ڕێزیان لێ‌دەگرم و ئامانجیشم لەم قسانە دەرخستنی ڕاستەقینەیە بۆ بەرەی تازە و بەرەکانی دواتر نە ک خۆهەڵکێشان.

بیری نوێخوازی و شیعری نوێی کوردی دوو دیاردەی جیاواز بوون، من لە یەکەمیاندا دەوری سەرەکیم بینی و ئەو مافە بۆ خۆم

دەپارێزم، بەڵام لە دووهەمیاندا پەسندی ئەوە دەکەم کە، سێ شۆڕەسواری گەورە، سوارە و حەسەنیانی و "چاوە" ئاڵاهەڵگر بوون و من بە ماوەیەک دوای ئەو سێ کەسە شیعری کوردیم گوتووە و بۆ تەواوی ئەم قسانە بەڵگەم بە دەستەوەیە.

ئەم دێڕانەی خوارەوە، درێژەی ئەم باسەیە دوو ساڵ بەر لەمە لە وتووێژێکی دوور و درێژدا لە ڕۆژنامەی "پەیام" چاپی لەندەن چاپ کراوە و ئەوا لێرەدا بە گۆڕانکارییەکی کەمەوە دووپات دەبنەوە، ئیتر پرسیار و وەڵام نین و ڕوونکەرەوەی هەندێ لایەنی تاریکی ئەم ساڵانە وەک بەشێک لە مێژووی ئەدەبی کوردین.

من یەکەم شیعری نوێم بە ناوی "بوف کور" واتە "کوندەبۆ"وە، بە زمانی فارسی لە ساڵی ١٣٣٢ لە زیندانی مەهاباد گوتووە.

مرا ای مرد زندانبان رها کن
که زندان تو عمرم را سر آورد
بیا از پای من بردار زنجیر
که زنجیر تو جانم را در آورد

*ل ٤١ سرود پرستو (چاپی یەکەم)*

دوا بە دوای کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٣٢ی شای ئێران و دەوڵەتانی ڕۆژاوا دژ بە حکومەتی میللی دوکتۆر "موسەددیق" کە من لە پێش ئەو کۆدیتایەدا پیشەی ڕۆژنامەفرۆشیم هەبوو و ڕۆژنامە و گۆڤاری "بسوی آینده" و "چەلەنگەر" و "کاویان" و "تۆفیق" و

"حاجی‌بابا" م دەفرۆشت لەلایەن پۆلیسی شا و دەرەبەگەکانی بۆکانەوە گیرام و هەر چەندە تەمەنم کەمتر لە ١٨ ساڵان بوو، لە بەندیخانەی مەهاباد توند کرام. کات و ناکات، شیعرم بۆ زیندانییەکان دەخوێندەوە و وا هەبوو زۆربەی ئەوان گاڵتەیان پێ‌دەکردم و لایان وا نەبوو ئەم شیعرە نوێیانە هەر شیعریشە. من کە شوێنی زۆرم لە مامۆستایانی نەمر "نیمایووشیج" و "شاملوو" هەڵگرتبوو نەک هەر گوێچکەم بەم گاڵتانە نەدەدا، بەڵکوو شێلگیرتر و سەقامگیرتر درێژەم بە گوتنی شیعری نوێ دەدا. دوای ئەوەی لە بەندیخانە هاتمە دەرێ بە شیعرەکانمدا چوومەوە و ئەوانیشم هاورێ لەگەڵ شیعری تازەتردا بۆ چاپ ئامادە کرد.

شیعری "بوف کور" لە ناخی دڵمەوە هەستابوو، ئاوێنەیەکی باڵانوێن لە هەست و مەبەستم بوو، شیعرەکە ماوەیەک دەرەنگ دوای گوتنی، لە گۆڤاری "امید ایران" و "آسیای جوان"ی چاپی تاراندا بڵاو کرایەوە و زۆر باش دەنگی دایەوە، باش نازانم بەڵام لام وایە وردە وردە زۆربەی گۆڤارەکانی تاران وەک "تهران مصور" "ترقی" و... کە بۆنی شیعری نوێیان لێ دەهات، شیعرەکانمیان یەک لە دوای یەک چاپ دەکرد، وەک

"شب شاعر" ١٣٣٨
"تمنا" ١٣٣٩
"سرود پرستو" ١٣٣٨
"گریز" ١٣٣٨ "ناآشنا" ١٣٣٧

کە لە ساڵی ١٣٤١ لە کتێبی "سرود پرستو"شدا چاپ کران. کتێبی "سرود پرستو" لە زۆربەی ماڵ و کتێبخانەکاندا جێی خۆش کردووە

بەڵام گۆڤارەکان هەر لە تاران دەردەچوون و ناوچەی موکوریان بە گشتی خاوەنی هیچ بڵاوکراوەیەکی فارسی یان کوردی نەبوو.

کاتێ شیعری نوێی "دروغ" م لە "امید ایران" دا لە ژێر چاوەدێری خاوەن شکۆ "سیمین بهبهانی" چاپ کرد، ئیتر بڕوای زیاترم بە خۆم پەیدا کرد و دڵنیا بووم کە دەتوانم شیعر بڵێم، چون گۆڤاری "امید ایران" شیعری هەموو کەسێکی چاپ نەدەکرد و لەبەر ئەوەی "پرویز کلانتری" ش یارمەتی خاتوو سیمینی دەدا لاپەڕەی ئەدەبی گۆڤارەکە لە گۆڤارەکانی دیکەی ئەو سەردەمە دەوڵەمەندتر و بەهێزتر بوو.

ساڵانی ١٣٣٩ تا ١٣٤٨ سەردەمی گەشەکردن و پەرە سەندنی شیعری نوێی فارسی بوو، شیعری نوێ گەلێک زیاتر لە جاران لە چاپەمەنییەکاندا بڵاو دەبوونەوە و شاعیرانی نوێخواز یەک لە دوای یەک لە ئاسمانی ئەدەبی ئێراندا سەریان هەڵدەدا. ناوی نیما و شاملوو ئەستێرەی گەشی ئاسمانی ئەو ڕۆژانە بوون.

سەرەڕای هەوڵی زۆری ڕژیم بۆ کۆنترۆڵی پەیامی شیعرەکان، شاعیرانی بەرپرس بە هۆی کینایە و ئیستیعارەوە بیری کۆمەڵایەتی - سیاسی خۆیان دەگەیاندە خوێنەر، جگە لەو دوو کەسە، هەندێ شاعیری لاوی ئەو سەردەمە وەک مهدی اخوان‌ثالث، نادر نادرپور، سیمین بهبهانی، هوشنگ ابتهاج، سهراب سپهری، حمید مصدق، نصرت رحمانی، یدالله رویایی، منوچهر آتشی، رضا براهنی و م آزاد هێور هێور ناویان دەردەکرد.

من ناوی ئەو شاعیرانە بۆیە دەهێنم هەتا بارودۆخی ئەو دەمی شیعری نوێی فارسی ڕوون بکەمەوە و بگەمە ئاکامی ئەوەی کە شیعری نوێی کوردی ڕۆژهەڵات، تەئسیری ڕاستەوخۆی ئەو شاعیرە فارسانەی لە سەر بوو. لە ڕاستیدا بیروبۆچوونمان لەمەڕ هونەر و

شیعر هەمان بۆچوونی شاعیرە فارسەکان بوو، شیعری نوێی کوردیی کوردستانی باشوور ماوەیەک درەنگتر، تەنانەت دوای کۆچی دوایی "گۆران" شوێنی لەسەر شاعیرەکانمان دانا، بە بێ هیچ گومانێک ئەوە شیعری نوێی فارسی بوو کە لە وەرچەرخان و ڕوو کردنە شێوازی نوێدا هاندەری ئێمە بوو. ئەوەش لە بارودۆخی ئەو دەمی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا شتێکی ئاسایی‌یە و دەبێ لە بیرمان نەچێ کە لە ساڵانی دوای کۆدیتای ١٣٣٢ ئیتر کێ دەیوێرا کتێب و چاپەمەنی ئەو دیو لای خۆی ڕاگرێ یان بیدا بەم و بەو.

بە کورتی من بە چەند ساڵ پێش ئەوەی نوتفەی شیعری نوێی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ببەسترێ و یەکەم شیعری نوێی کوردی بخوڵقێ[1]، شیعری نوێی فارسیم گوتووە و بیری نوێخوازیم بە کردەوە هێناوەتە نێو ئەویندارانی شیعر و شاعیری لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هیوادارم کاتێ باسی ئەو ڕاستەقینە مێژووییانە دەکەم خوێنەر بە باشی قسەکانم هەڵسەنگێنێ و هەست بەوە نەکات کە دەمەوێ مافی کەسێک بفەوتێنم یان خۆم هەڵکێشم، من دۆستی نزیکی سوارەی نەمر و عەلی حەسەنیانی ڕەحمەتی بووم و هەرگیز نامەوێ قسەیەک بکەم کە بۆنی بێئەمەگی و خۆ خۆشەویستی لێ بێ، بەڵام کاتێک تۆ باسی مێژوو دەکەی و لە ڕووداوێک دەدوێی کە ڕووی داوە و تێپەڕ بووە ئیتر نە دەتوانی بیگۆڕی و نە هۆیەکیش بۆ ئەم گۆڕانی حەقیقەتە هەیە. بەڵێ من ئاڵاهەڵگری بیری نوێ کردنەوەی شیعر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووم و یەکەم کەسیش بووم لە ناوچەکە کە شیعری نوێم بە فارسی گوتووە، بەڵام سوارە و حەسەنیانی و چاوە چەند ساڵ دوای ئەو ڕووداوە و پێش من

[1] لاپەڕەکانی سرود پرستو

دەستیان بە شیعری نوێی کوردی کردووە و ئەو مافەش بۆ هەمیشە بۆیان پارێزراوە.

ڕوو کردنە شیعری کوردیی نوێش بۆ من لە ژێر تەئسیری ڕاستەوخۆی ئەوانەدا بووە، واتە بۆ ئەوەی لە شیعری فارسییەوە ڕوو بکەمە شیعری نوێی کوردی تەئسیری زۆری سوارەم لەسەر بووە.

خۆشحاڵم کە ئەو بیرە نوێیەی کە من "هێنەر" و "داهێنەری" بووم شاعیرانی مەزنی وەک ئەو سێ کەسە خستیانە قاڵبی وشەی کوردییەوە و یەک دوو ساڵ دوای ئەوە شیعری نوێی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو بە شیعری ڕاستەقینەی سەردەم.

سەبارەت بە سەرەتاکانی شیعر گوتن و هۆی چوونە بواری شیعرەوە پێویستە دەست نیشانی دوو هۆی سەرکی بکەم: یەکەم قەریحەی زاتی و دووهەم تەشویق و هاندان.

خوا لێخۆشبووی باوکم "میرزا عەبدوڵڵا حاجی ئەحمەد" حەزی زۆری لە شیعر هەبوو گەرچی سەوادێکی وای نەبوو کە شیعر بڵێ بەڵام وەک ئەویندارێکی شیعری عیرفانی و ئایینی کات و بێکات شیعری لە سەر لێو دەگەڕا، کاتێ من لە قوتابخانە فێری خوێندن و نووسین بووم ئیتر دوو سێ کتێبی لەبەر دەم دادەنام و دەیکوت بە دەنگی بەرز بۆم بخوێنەوە، لام وایە جگە لە هەستی زاتی، ئەو شیعر خوێندنەوانە بەرەو دنیای خەیاڵاوی شیعری بردم و هەر لەو سەردەمانەوە شیعر لە تانوپۆم ئاڵا و ئیتر هیچ کاتێ لێم جیا نەبۆوە، بەڵام سەرهەڵدانەکەی ئەو کاتە بوو کە کەوتمە بەندیخانەوە بۆ دووهەم جار.

تـەنیـایی، بیـر کردنـەوە لـە ژیـان، و ناسـک بوونـەوەی هـەسـت و شعووری کۆمەڵایـەتـی لـە پاڵ کـات و مـەجـالی زۆر بۆ خوێندنـەوە و نووسین، هەستی دەرنەبڕاویان بە شیعر بۆ دەربڕیم.

لە بـەندیخانـە شـەو و ڕۆژ کـارم خوێندنـەوەی شـیعر بـوو، یـەکـەم شیعرە عەرووزییەکانیشم هەر لە بەندیخانەی مەهاباد گوتووە، ئەم دوو شـێوازە شـیعرە دەتـوانم بڵـێم هاوکـات لـەگـەڵ یـەکتـری لـە مندا خولڤـان، وا هـەیـە هـۆی مـەسـەلـەکـە ئـەوە بـێ کـە مـن خـۆم ڕۆڵـەی سـەردەمـی وەرچـەرخـانی شـیعرم و ڕاسـت لـە سـەردەمێکدا مێشـکم ئاوێتەی بیری شیعر بوو، کە تایبەتمەندییـەکـەی بریتـی بـوو لـە ژیانی هاوبەشی شیعری نوێ و کلاسیک، ئەو دوو دیاردەیە لـە سـەردەمـی لاویەتیمدا شان بە شانی یەکتر دەڕۆیشتن، منیش شـانم دابـووە بـەر هەردووکیان جا درەنگتر کە بارستایی شیعری نوێ لە ئێران قورستر بوو مەیدان ببووە شـوێنی سـوارچاکانی شـیعری نـوێ. ئاسـایی‌یە کـە منــیش زۆرتــر ڕووم کردبــووە ئــەمیــان بێئــەوەی ئــەوی تــرم بــە یەکجاری بەجێ هێشتبێ. ژیانی هونەری من ئاوێتەی ئـەو ناتـەبایی و لە عەینی کاتدا ئەو شان بە شانی و ژیانە هاوبەشەی شیعری نـوێ و کلاسیکە.

یـەکـەم شـیعری عـەرووزیـم لـە سـاڵی ١٣٣٦ یـا ١٣٣٥دا نـارد بـۆ گۆڤاری "اطلاعات هفتگی" و لـە وەڵاممدا نووسـیان مـاڵی شـیعرەکـەت کـە لـە بنـەڕەتـەوە وێرانـە! بـەڵام مـن شـلوێ نـەبـووم و درێـژەم بـە کارەکەم دا، ئەم قسەیە بۆ شاعیرە لاوەکان دەکەم کە نەکا کۆڵ بدەن و قسەی ئەوتۆ دڵساردیان بکاتەوە، ئەگەرچی ئەمڕۆ گەلێک جیاوازە و کـورد خـۆی خـاوەنـی چاپـەمـەنـی خۆیـەتـی، پـەیـوەنـدی پارچـەکـانی

کوردستان گەلێک زیاترە و وا هەیە شاعیری لاوی کورد قسەی وا سارد هەر نەبیستێ.

هەرچۆنێک بێ من کۆڵم نەدا و لە هەمان ساڵدا شیعرێکی دیکەم بۆ گۆڤاری "اطلاعات هفتگی" و دوا بە دوای ئەو بۆ گۆڤاری "ترقی" نارد کە ئەوانیش هیچیان چاپ نەکران، کاتێ دەگەڕێمەوە و سەیری ئەو ساڵانە دەکەم کە سەرەڕای ئەو هەموو نامێهرەبانیانە هێشتا هەر ورەم بەرنەدا و بە بێ پشتگیریی لایەنێک، بە تاقی تەنیا لە بەرانبەر ئەو هەموو تەنگ و چەڵەمەیە ڕاوەستام، لام وایە ئەو دەم وەها لە شیعردا توابوومەوە کە شیعر ببوو بە بەشێک لە وجوودم و ئیتر نەمدەتوانی دەستی لێهەڵگرم.

لە بەهاری ١٣٣٧دا شیعری "پڕشنگ"م لە گۆڤاری "ترقی"دا چاپ کرا و عینوانە کوردییەکەشی لە کۆتایی شیعرەکەدا بە فارسی واتا کرابۆوە. هەر بە شوێن ئەودا شیعرێکی نوێی دیکە و دوا بە دوای ئەو غەزەلێکی عەرووزیم لە گۆڤارەکاندا بڵاو کرایەوە کە گەلێ جیاوازییان لەگەڵ شیعرەکانی پێشوودا بوو؛ بۆ نموونە بەتایبەت غەزەلەکە هاوشان لەگەڵ غەزەلە باشەکان شەقامی دەپێوا.

*"روزگاری رفت و ما تنهای تنها ماندەایم*
*بیکس و کاشانە چون بومی بە صحرا ماندەایم*
*در میان موجهای سرکش طوفان عمر*
*قایق بی‌ناخدائیم و بە دریا ماندەایم*
*جز حقیقت چون نیاوردیم حرفی بر زبان*
*چون حقیقت در سکوتی تلخ تنها ماندەایم*
*آه... از آغاز هستی تا بە انجام وجود*

*در فریب وعده امروز و فردا ماندەایم"*

ئەو دوو شێوازە جیاوازە لە شیعرەکانمدا هاوکات و هاوشان ژیانی هاوبەشیان هەبوو. *لە ڕاستیدا چڕۆ کردنی بیری نوێخوازیی من لەسەر لقی شیعری عەرووزی بوو.*

سێبەری شاعیرانی پێشکەوتن خوازی ئەو دەم وەک "ابوالقاسم لاهووتی کرماشانی"، "محمد علی افراشته"، "ابوتراب جلی" و "پرویز کلانتری" بەسەر شیعری عەرووزی ئەو ساڵانەمەوە بە جوانی دیارە، بەڵام پێشەوای شیعریم، شاعیرانی نوێخوازی ئەو سەردەمە وەک "نیما"، "شاملوو"، "موشیری"، "ابتهاج" بوون و لە هەمووان زیاتر "فروغ فرخزاد" و "نوسرەت رەحمانی" شوێنیان لەسەر داناوم.

لە ساڵی ١٣٤١دا رادیۆ دیهلی هیندووستان "بەشی فارسی" کە ئەو دەم بیسەری زۆری لە ئێراندا هەبوو کێبەر کێیەکی شیعری دانا و منیش بە شیعرێکی عەرووزی بەشداریم کرد و جایزەی یەکەمم بۆ دەرچوو، بانگهێشتنی دیهلییان کردم کە نەمتوانی بچم و باڵوێزخانەی هیندووستان بەم بۆنەیەوە لە تاران ڕێورەسمێکیان بەڕێوە برد کە زۆربەی شاعیرانی بەناوی ئێران تێیدا بەشدار بوون، جایزەکە "دکتر عیسی صدیق" وەزیری وەختی پەروەردەی ئێران پێی دام کە بریتی بوو لە هەیکەلێکی عاجی "شیوا"، یەکێ لە خودایانی هیند، و هەروەها پێنج کتێب لە کتێبە ئەدەبیەکانی "جواهر لعل نهرو" ئیمزا کراو لە لایەن ئەوەوە، منیش کتێبێکی "سرود پرستو"م کە تازە لە چاپ دەرهاتبوو بە دیاری دا بە دوکتور "منجدسن" باڵوێزی باڵوێزخانە و ئێستا هەموو بەڵگەکانی بە دەستەوەیە تەنانەت وێنەکانیشی.

ئەو شەوە دۆستی لەمێژینەم "سەعید سوڵتانپوور" بە زۆر شاعیری بەناوبانگی سەردەم کە لە لایەن باڵوێزخانەوە بانگهێشتن کرابوون وەک "نادر نادرپور" "حەمید موسەدیق" "سیمین بهبهانی" و "نوسرەت رەحمانی" ناساندم کە داوتر لە سەفەرەکانی تاراندا لە "کافه شهرداری" چاوم بەو کەڵە شاعیرانە دەکەوت و هەر لەڕێگەی زیندە یاد سەعیدیشەوە لەگەڵ نەمر ئەحمەد شاملوو ئاشنا بووم و جاروبار بە خزمەتی دەگەیشتم.

سەبارت بە چۆنیەتی ڕوو کردنە شیعری نوێی کوردی، دەبێ بڵێم شیعری نوێی فارسی بەرەو شیعری نوێی کوردی بردم و دیارە سەردەم، سەردەمی شیعری نوێ بوو؛ گەڕانەوەش بە هیچ جۆرێ نەدەگونجا.

لەم پەیوەندیەدا پێویستە ئاماژە بە خاڵێکی دیکە بکەم کە دوا بە دوای کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٣٢ مەسەلەی شیعری نوێ گرینگایەتی زۆری پەیدا کرد و بە گشتی دوای ئەو ڕووداوە بەرەی پێشکەوتنخواز لە سەنگەری شیعری نوێدا دژ بە لایەنگری ڕژیمی شا دەوەستان کە زۆربەی زۆریان دوژمنی شیعری نوێ بوون و گاڵتەیان پێدەکرد. شیعری "آرش کمانگیر"ی سیاوەش کەسرایی دوای شیعری "چاره رنجبران"ی لاهووتی کە ئەویش لە سەر شێوازی نوێ گوترابوو زیاترین برەوی لە نێو بەرەی چەپدا پەیدا کرد و بووە هۆی پاشەکشەیەکی جیددی لایەنەکەی تر و ئیتر لانی کەم لە نێو بەرەی پێشکەوتنخوازدا دژایەتی شیعری نوێ نەدەکرا.

هاندەری سەرەکیی من بەرەو شیعری نوێی کوردی کەمتر تاکە کەس و زیاتر بارودۆخی گشتی کۆمەڵایەتی ـ سیاسی بوو. ئەوەندەی خۆم هەستم پێ کردبێ فەزا سیاسی ـ کۆمەڵایەتییەکەی ئێران و هەر ئەو بارودۆخەی ساڵانی دوای ١٣٣٢ش بوو کە من نەفەسم تێدا دەکێشا و تێیدا ببوومە لایەنگری شیعری نوێ.

یەکەم شیعری نوێشم وەک پێشتر گوترا لە ساڵی ١٣٣٢ کاتێ لە بۆکان گرتیانم و ناردیانم بۆ بەندیخانەی مەهاباد، لەوێ گوتووە، ئەو دەم تەنیا بیر لە سبەینێ و ژیانی بەختەوەرانەی دوارۆژ دەکرایەوە و دوێنێ بۆ هونەرمەندان مردبوو، شاعیرانی نوێخواز بە پێشوازی بەیانییەوە دەچوون و خۆیان لە شە دوور خستبوە وە.

ڕژیمی کۆدیتا بۆ هونەرمەندان، دوێنێ بوو؛ خەبات بۆ ژیانی بەختەوەرانە دەبوایە چاوی ببڕێتە ئاسۆی سبەینێ.

ماوەیەکی کەم لە مەهاباد کاتی خزمەتی سەربازی بەشی کوردی رادیۆ مەهابادم بەڕێوە دەبرد و بە داخەوە کاتێ سێ مانگم مابوو سەربازییەکەم خەڵاس بێ خرامە زیندانەوە تا تەواو بوونی ئاخرین ڕۆژی سەربازی هەر لە زیندانی سپای ئەو ڕۆژەی مەهابادا بووم.

ڕادیۆ مەهاباد، ڕادیۆی ئەڕتەش بوو؛ ڕۆژی دوو سەعات بەرنامەی بە زمانی فارسی و کوردی بڵاو دەکردەوە. خوا لێخوشبوو "خەلیل سەدیقی ـ سەید رەحیمی قورەیشی ـ برایمی ئەفخەمی، موحەممەدی ماملێ ـ خانباغی و برایانی مەتەری" بەرنامەیان بڵاو دەکردەوە و هەر لەو ساڵانەشدا بوو کە رۆژنامەی کوردستان لە تاران وەدەر کەوت و لە شارە کوردەکان دەستی کرد بە بڵاو بوونەوە، ڕۆژنامەکە سەرەڕای ئەوەی پڕوپاگەندەیەکی زۆر

بوو بۆ سوپای ئێرانی لە نێو شۆڕشی ئەیلوول و بە گشتی باشووری کوردستان، لە کوردستانی ڕۆژهەلاتشدا تەبلیغاتێک بوو، کە گوایە ئێمە بۆ کوردەکانیش بەرنامە بڵاو دەکەینەوە، بەم حاڵەش ئەو ڕۆژنامەیە دەرەتانێک بوو بۆ گەلێ نووسەر و شاعیری لاوی ڕۆژهەڵات کە لە ڕێگەی ئەو ڕۆژنامەیەوە بەرهەمەکانیان بڵاو بکەنەوە.

ئەودەم سوارە و عەلی حەسەنیانی و فاتحیش شیعریان لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو دەبۆوە و منیش هاوکاری ڕۆژنامەکەم بە غەزەل و چوارینە و چوارکۆپلەی کوردی دەکرد و ئەوانیش چاپیان دەکرد، ئەو چوارکۆپلانە لە ئێران بە چوارکۆپلەی نیمایی دەناسران و لە سەرەتای پەیدا بوونی شیعری نوێی فارسیدا نزیک بە هەموو نوێخوازەکان چوارکۆپلەی نیماییان دەگوت و منیش پێشتر ئەو شێوە شیعرەم بە فارسی گوتبوو، جا لەو ساڵانەدا بە کوردیش دەستم کردبوو بە هۆندنەوەیان.

ڕادیۆ کرماشانیش بۆ من دەرەتانێکی دیکە بوو. ئیتر بە گشتی تێکەڵاوی شیعری کوردی بووبووم و لەم سێ شوێنانە دا بڵاوم دەکردنەوە، بڵاو بوونەوەی شیعرەکانم بە دەنگی رادیۆ تۆنیکی بەڕێز "شوکروڵڵا بابان" هۆگری زۆری بۆ پەیدا کردبووم بە تایبەت چەند شیعرێک کە بۆ مەسەلەی دابەش کردنی زەوی بە سەر جووتیارەکانمدا گوتبوو کە یەکێک لەوان:

*"بۆ پێشەوە جووتبەندە*
*دنیا بە تۆوە بەندە"*

بوو. دوا بە دوای ئەو شیعرە، دەم لە سەر پشت داوا لە ڕادیۆ کرماشان دەکرا کە دووپات بێتەوە و چەند جاریش دووپات کرایەوە. پێنج خشتەکییەکم ساز کرد کە برەوی لە شیعرەکەی پێشووش زیاتر پەیدا کرد و ناوی منی بەتایبەت لە نێو دێهاتییەکان و جووتبەندەکان خستە سەر زمان و هەر بەو ئەندازەیەش ڕق و قینی دەرەبەگەکانی گەیاندە ئەوپەڕی خۆی:

*"جوتیاری شەو نەخەوتوو، هەستە ئەمڕۆ باوتە*
*ڕۆژی ئاواتی ژن و منداڵ و پیر و لاوتە*
*سواری ئەسپت بە و برۆ ئەمجارە نۆبەی ڕاوتە*
*هەستە ڕۆژی تۆڵەیە، تۆڵەی دڵی برژاوتە"*

دوا بە دوای ئەم حەیس و بەیسانە، کەمکەم کەوتمە بیری ئەوەی شیعرەکانم گردوکۆ بکەم و لە بیچمی کتێبدا بڵاویان بکەمەوە، کۆمەڵێک لە شیعرە فارسییەکانم پێکهێنا و ناوی "سرود پرستو" واتە "ئاوازی پەڕەسێلکەم" لێنا و بە ئەرکی زۆر و زەحمەتی ئەوتۆی "سەعید سوڵتانپوور" لە تاران چاپم کرد ١٣٤٢. کتێبەکە هاوکات غەزەل، چوارینەو شیعری نوێی گرتبووە بەر. بڵاو بوونەوەی کتێبەکە لە تاران و هەروەها لە کوردستان منی گەیاندە قۆناغێکی نوێتر، تەنیا لە بۆکان، کە ئەو زەمانە شارێکی یەکجار بچووک بوو ٢٠٠ نووسخەی لێ فرۆشرا و لە شارەکانی تری کوردستانیش پێشوازی بەرچاوی لێکرا؛ ئەوە یەکەم کۆمەڵە شیعری نوێی شاعیرێکی کورد بوو کە لەو سەرودەمانەدا لە ئێران بڵاو دەکرایەوە و هەر ئەوە خۆی ڕووداوێکی گەورە بوو.

دوای "سرود پرستو" ئیتر هیچ گۆڤارێکی فارسی تاران نەما کە درگای لە سەرم دابخرێت و ئەوەش کاری زیاتری خۆم و پاراویی زیاتری شیعرەکانمی دەویست. وەک شاعیرێکی ساحەب دیوان، ئیتر چاوەڕوانی کاری گرینگترم لێدەکرا و منیش شەو و ڕۆژم نەدەناسی، دەمخوێندەوە و دەمنووسی.

لەو ماوەیەدا پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ شاعیرانی نوێخوازی پێشکەوتنخوازی فارسی پەیدا کردبوو، ئەویش زۆرتر هەر بە بۆنەی سەعیدەوە بوو. چون من خەڵکی بۆکان بووم و سەعید تارانی، و من هەر بە چوار- پێنج مانگ جارێک ڕێم دەکەوتە تاران.

سەعید لاوێکی خوێنگەرم بوو، هەر لە سەرەتای ساڵەکانی چل کە من ناسیم لە زۆر بواری هونەری وەکوو شیعر و شانۆگەریدا چالاکی دەنواند و ئەوەی لە بیرم بێ لە ساڵی ١٣٤٧دا شیعرێکی فارسیم گوتبوو کە ناوی "شب" بوو شیعرەکەم لە تاران خوێندەوە کە ئەوەندەی پێ باش بوو دەستبەجێ لێی وەرگرتم و ناردی بۆ گۆڤاری "خوشە" کە سەرنووسەرەکەی کەڵەپیاوی شیعری ئەمڕۆ "ئەحمەد شاملوو" بوو و لەبواری شیعر و ئەدەبی فارسیدا قسەی هەوەڵی دەکرد، دوای ١٥ ڕوژ شیعرەکە بە تایتلێکی گەورە لە خوشەدا چاپ بوو، بوو بە هۆی ئەوەی دوو شاعیری گەورە و ناسراوی ئێران "حەمید موسەدیق" و "نوسرەت رەحمانی" بابەتی لە سەر بنووسن و خوا لێخۆشبوو شاملووش بە "سەعید" بڵێ بە دۆستە کوردەکەت بڵێ شیعرمان بۆ بنێرێ. ئەوەش بۆ شاعیرێکی گومناوی کوردی دانیشتووی بۆکان ڕووداوێکی گەورە بوو و لێرەدا من شیعری "شب" جارێکی تر دەنووسمەوە.

# شب

*شبی بود از غبار تیره اندوه‌ها، لبریز*
*شبی بود از نگاه خسته دیوانه‌ها، سرشار*
*غم از دیوارها می‌ریخت*
*تبسم بر لبان روشن آئینه‌ها، می‌مرد*
*خدا در آسمان بی ستاره*
*تلخ، بد آهنگ می‌خندید*
*و سیاهی تا بلند بیکران‌ها، سایه می‌گسترد*
*شب اندوهناکی بود*
*من و او با هم از اندوه مردم، قصه می‌گفتیم:*
*- چرا موج نسیم نیمشب بر ما نمیلغزد؟*
*- چرا لبخند انسانها*
*به روی شاخه‌های آشنائی‌ها نمی‌رقصد؟*
*- چرا شب باغ خون بر سنگفرش راه می‌پاشد؟*
*- چرا طرح هزاران شعر، بر دیوارهای شهر می‌میرد؟*
*و بانگ خشم ما، در آسمان شهر، می‌لرزید*
*و مردم خنده خورشیدها را خواب می‌دیدند*

......

*شب اندوهناکی بود*
*نه آوائی ز کس آمد*
*نه مردی زان میان برخاست*

خوشه، شماره ۹ شانزدهم
اردیبهشت ٤٧ صفحه ٣٤

درەنگتریش ئەم پێوەندییە بە تایبەت لەگەڵ "نوسرەت رەحمانی" پارێزرا.

هەر لەو دەوروبەرەدا لە نێو شیعرەکانم کە دەم لەسەر پشت لە گۆڤارەکاندا بڵاو دەکرانەوە، شیعرێکی دیکەش بوو بە هۆی لەسەر نووسینی نوسرەت رەحمانی کە بە جارێ منی وەها دڵخۆش کرد کە شەوانەش خەوم لێنەدەکەوت.

لەمەڕ ناسیاویم لەگەڵ شاعیرانی نوێخوازی کورد، دەبێ بڵێم من لەو ساڵانەدا لە بۆکان پیشەی کتێبفرۆشیم هەبوو، بەر لە کتێبفرۆشی ڕۆژنامەفرۆش بووم، خوێندەوار و ڕۆشنبیری شارم دەناسی، دووکانەکەم شوێنی هاتوچۆی کتێبخوێن و کتێبناس و باس‌وخواس بوو، قسە و باسەکان زیاتر لە دەوری شیعر و ئەدەب و هونەر دەگەڕان و کەمتر دەچوونە باسی سیاسەتەوە.

کاک سوارە ئیلخانی‌زادە جگە لەوە کە لە بۆکان دەژیا و هاوکەلاسم بوو، نێوانیشمان یەکجار خۆش بوو، دواتر کە چوو بۆ تاران کاتێ بۆ سەردان دەهاتەوە بۆکان گەلێک جار سەری لێ دەدام و باسی کتێب و هونەر و شیعری دادەمەزراند، سوارە قەڵەمێکی بەتوانای هەبوو، بەتایبەت کە شیعری باش دەناسی و نەقدی شیعری شاعیرانی زۆر بە باشی دەکرد، بۆ منی لە شارۆچکەی ئەودەمی بۆکان قەتیس ماو، پەیوەندی لەگەڵ سوارەی نەمر دەرەتانێکی باش بوو. لە لایەن ئەوەوە گۆڕانکارییەکان و ڕووداوە هونەرییەکانی ئێرانم دەزانی. کاک عەلی حەسەنیانیشم دەناسی، هەر جارێ لە مەهاباد و دواتریش لە میاندواوەوە دەهاتە بۆکان سەردانی دەکردم،

شەوانە لەگەڵ یەکتری دادەنیشتین و شیعرمان دەخوێندەوە. کاک فاتحیشم چوار جار بینیبوو، دوو جار لە تاران و دوو جار لە بۆکان، شیعری "فەڕشی ماڵەکەم"ی ئەو شاعیرە چالاکەم کە لە ڕۆژنامەی کوردستاندا خوێندەوە لە بەرم کرد. لەگەڵ کاک "جەلال مەلەکشا"شدا کەمێ درەنگتر لەوان پەیوەندیم بەست و ئەم پەیوەندیانە ئێستاش هەر بەردەوام و بەربڵاون.

بەڵام بە داخەوە تێکەڵاوی و ناسیاویی ئەوتۆم لەگەڵ شاعیرانی کوردی باشوور و باکووری کوردستان نەبوو. ئەوەش جیایە لەو ڕاستییە کە هەر لە ساڵانی سەرەتاوە لە ڕێگەی شیعرەکانیەوە "گۆران"م دەناسی. ئەو دەم بۆ یەکێکی وەک من نەدەگونجا کتێب و چاپەمەنی ئەودیو پەیدا بکەم. بۆ ئەم کارە دەبوایە لەخۆبوردوویی و تێکەڵاوییم لەگەڵ سیاسەت و تەنانەت حیزب و تاقمی سیاسی هەبێت کە منیش ئەو تێکەڵاوییەم نەبوو.

من هێشتا مەسەلەی تاوانی چالاکییە سیاسییەکانی پێش کۆدیتای ساڵی ١٣٣٢م چارە نەکردبوو، هەموو ساڵێ چەند جار بانگ دەکرامە دادگای نیزامی لە مەهاباد و ورمێ و هەر لە ترسی ئەم شوێن کەوتن و هەڕەشانەش خۆم کرد بە سەرباز و بۆ ماوەی دوو ساڵێ خۆم لە شەڕی دادگاکان نەجات دا و کوردیش دەڵێ دوای دوو ساڵ خودا خۆی دەمێنێ و ملکی!

دوا بە دوای گۆران، کەمکەم لەگەڵ شیعری شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت ناسیاویم پەیدا کرد و بێ سێودوو دەڵێم تەئسیرێکی ئەوتۆم لە هیچ کام لەم دوو شاعیرە گەورەیە وەرنەگرت. هۆیەکەشی ئاشکرایە، من بەتایبەت لەو ساڵانەدا پەیوەندییەکم لەگەڵ شیعری

نوێی باشوور نەبوو، مەسەلەی شیعری عەرووزی کوردی جیاوازە. بەڵام ئەمڕۆ وا نییە من شیعری شاعیرانی ئەودیو دەخوێنمەوە و دەتوانم بڵێم ڕۆژانە ئاگام لە گۆڕانکارییە ئەدەبییەکان هەیە، گەرچی ئێستاش وا هەیە نەتوانم تەئسیر لە شاعیرانی باشوور وەربگرم.

من پەروەردەی ساڵانی پێش کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژم و پێش ئەو گەلێک لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا چالاک بووم و بە قەدەم و قەڵەم پشتگیری بەرەی پێشکەوتنخوازم کردبوو، بڵاوکراوەکانی حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانم لە بۆکان بڵاو دەکردەوە و پێوەندیەکی نزیکم لەگەڵ "جبهه ملی" ئەو ساڵانەدا هەبوو، یارمەتی ڕێبەرانی ئەو جەبهەیەم دژ بە درەبەگەکانی بۆکان داوە و بۆ هەموو تەمەنم دژایەتی ئاغا و دەرەبەگم کردووە. ئەوەش بۆ کەسێکی خەڵکی بۆکان، ئاساییە، زوڵم و زۆری ئاغاوات لە بۆکان بەتایبەت زوڵم و زۆری مینەی مەحموود ئاغا و حاجی سمایلی برای، نە دەنووسرێ و نە بە هیچ تەرازوویەک دەکێشرێ. هەموو کەسێک لە بۆکان دژی ئاغاواتە، بزووتنەوەی ناو شاری بۆکان کە خوا لێخۆشبووان "حاجی قاسمی کەریمی، عەبدوڵڵا ئێرانی، عەلی میرەبەگ، سەید تەهای تەنەکەساز، حوسەینی فاتیحی، برایمی تەننازی، حوسەین تەهایی، و میرزاحەمە ڕەئووفی حافزولقورئان، لە پێشڕەوانی بوون و تەنگیان بە ئاغاواتی بۆکان هەڵچنیبوو. ئەم ڕاپەڕینانە پێش کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژ ڕوویان دا، زۆربەی زۆری ڕاپەڕیوەکانی شار بەرگدروو بوون، لە نێو خەیاتەکانی بۆکاندا سوننەتێکی بەهێزی شۆڕشگێڕی هەبوو کە دەبێ لێی بکۆڵدرێتەوە، باوکی منیش خەیات بوو، بە هەمان هەستی بەهێزی دژایەتی دەرەبەگ و ئاغاواتەوە، بەڵام هێدی و هێمن و کونسرڤاتیڤ بوو، من

وا نەبووم گەلێک توندوتیژ بووم، شەڕم بە ئاغاکان دەفرۆشت و بە زۆرەملی ڕۆژنامەی شۆڕشگێڕانەم بە سەردا دەبڕین. ئەوکات نەیاندەوێرا هیچ بڵێن و هیچ بکەن، بەڵام کاتێ حکومەتی میللی "دوکتۆر موسەددیق" ڕووخا و شا گەڕایەوە بۆ ئێران، ئیتر ئاغاوات بوونە دارەدەستی پۆلیس و جەندەرمە و بەربوونە گیان وماڵی خەڵک، خەباتکارەکان یان هەڵاتن یان گیران و کوژران، منیش هەتا وە خۆم هاتمەوە گیرام و لە گەڵ حوسەینی تەهایی و حەمە ڕئووفی خەیات و برایمی تەننازی بە دەستووری مینەی مەحموودئاغا لە زیندانی مەهاباد توند کرام.

شیعری دوای کۆدیتا یان شیعری "تەسلیم" و "پێدا هەڵگوتن" بوو یان شیعری بەربەرەکانێ و خەبات؛ شاعیرانی بەرپرس هەموویان لە زومرەی خەباتکاران بوون، زمانی شیعری ئەمان زمانێکی ڕاشکاو و ڕوون نەبوو، حکومەتی نیزامی تەیموری بەختیار ئیجازەی بڵاو بوونەوەی ئەم چەشنە شیعرانەی نەدەدا و خاوەنەکانی بە قەولی ئەو سەردەمە دەخستنە کونەڕەشەوە، واتە زیندان؛ هەر لە بەر ئەم هۆیەش، زمانی شیعر ببوو بە زمانێکی "کینایی" و دەبوایە بە ئیشارە و ئاماژەی ناڕاستەوخۆ نیازی خۆت ڕابگەیەندایە.

درەنگتر، لە ساڵەکانی ١٣٥٠دا هەندێک وشە و عیبارەتیش یاساخ کرابوون، بۆ نموونە نەدەکرا لە شیعرەکاندا ناوی "شەو" بهێنی دەیانکوت ئەوە مەنزوورت "شا"یە. یان نەدەکرا وشەی "بەیان" و "تریفە" و "خۆر" بێنی دەیانکوت ئەوە بە شۆڕش و ڕاپەڕین هەڵدەڵێی.

شاعیرانی وەک سوارە و فاتیح بەو زمانە "کینایی"یە شیعریان دەگوت و هەندێ جاریش دەرفەتیان پەیدا دەکرد لە چنگاڵی سانسۆر

دەربچن و شیعرەکانیان بگەیێنینە خوێنەر و بۆ نموونە "کچی بەیان" ی سوارە و "فەڕشیماڵەکەم" ی فاتیح.

شیعری من ڕاشکاو و بێ‌پێچ و پەنا و ساکار بوو ـ هەروەک ئێستا، و نەیدەتوانی ئەو سنوورانە ببەزێنێ و خۆ بشارێتەوە؛ هەر بۆیەش ماوەیەکی زۆر بێدەنگ مامەوە و هیچم بڵاو نەکردەوە و ئەگەر شیعرێکیشم هاردانبیل بڵاو بکردایەتەوە شیعری غەرامی بوو. ئەو دوور کەوتنەوەیەش دیارە زیانی زۆری لێدام و نەمتوانی لەگەڵ ڕەوتی شیعردا بڕۆم. کورت و کرمانجی، من ئەو کەسە بووم و بارودۆخ ئەو بارودۆخە، ئاکامیش نەیدەتوانی شتێکی جیاواز لەوە بێت کە بوو.

لێرەدا پێویستە لە هەوێنی سەرەکی شیعری خۆم بدوێم!

*ئەوین منی پەروەردە کردووە، ئەوین بۆ هەموو ماوەی ژیانم لە گەنجییەوە تا ئێستا سێبەری بەرزی خۆی لەسەر سەرم گێڕاوە و بۆتە گەوهەر و زاتم و جیا بوونەوە م لەو گەوهەرە، نائاساییە.*

*ژن لە شیعرەکانمدا هەمیشە قسەی یەکەمی کردووە و بە هەمان شێوە ش دەمێنێ تا دەمرم، بەرپرسیارێکی کۆمەڵایەتی بە دوای ئەویندا دێت.*

*شیعری من وەک ژیانم ئاوێتەی ئەو دوو دیاردەیەیە، نامەوێ بکەومە شوێن مۆدەی ڕۆژ و خۆم بە شتێک هەڵکێشم کە نەمبووە و نیمە، من خۆم بە ئەوین هەڵدەکێشم و بۆ هەموو پاشماوەی ژیانم بە ئەوینەوە شانازی دەکەم.*

من شیعر ناخولقێنم، ئەوە شیعرە من دەخولقێنێ، وا هەیە لە بیری شیعریشدا نیم و کارم بە سەریەوە نەداوە بەڵام ئەو خۆی بەرەو پیرم دێ و ئاوقام دەبێ.

ئەو حاڵەتە، ئەو جەزم بوون و جەزبەیە لە ماڵ، لە دووکان، لە شەقام، لە کۆڵان، لە دەشت، لە چیا، لە شینگێڕی و لە زەماوەند وا هەیە دەستەملانم بێ، لە پڕ هەستێک لە دڵمدا هەڵدەقوڵێ و زۆر زوو دەبێتە شیعر. بەڵام دەبێ زوو فریای کەوم و تۆماری بکەم. جاری وا هەیە هەست بە ناتەواوی شیعرەکەم دەکەم، دەچمەوە سەری و چەند جار دووپاتی دەکەمەوە و دەستی تێوەردەدەمەوە، جاری واشە هەر بە دوو سێ جار تەواو دەبێ و دەینووسمەوە و پاڵی لێ دەدەمەوە.

کە دەڵێم شیعر من دەخولقێنێ ڕاست دەڵێم.

*من لە هەموو شتێکدا هەست بە بوونی شیعر دەکەم: ژن، سرووشت، جوانی، هەروەها ناتەواوی و نابەرابەری کۆمەڵایەتی و هەژاری و برسییەتی خەڵک، هەر کام لەو دیاردە سرووشتی و کۆمەڵایەتییانە تەژیی شیعرن، ئەوە تۆی دەبێ وەک شاعیر بتوانی شیعرەکە لە پڕ و پێست دەربێنی. ئەو مناڵەی تازە پێ هەڵدەگرێ شیعری تێدایە، تۆ دەبێ ئەو شیلەیە بمژی و وەک هەنگوینی شیعر بیدەی بە خەڵک، بەڵام خولقاندنەکەی لە ویست و ئیختیاری تۆدا نیە. بەگشتی هەموو دیاردەیەکی سرووشتی و کۆمەڵایەتی، شیعری خۆی لە ناخیدایە. شاعیر دەبێ ئەو ناخە هەڵبکۆڵێ و ئەو پەردە و ڕواڵەتەی لە سەر هەڵماڵێ، ئەوجار شیعر دەردەکەوێ.*

ئەوەی چ نیازێک بەرەو شیعر گوتنم دەبات، لە دەست مندا نیە. ئەوە هەستی منە و دەبێ ئەو نیازە هەبێ، بەڵام هەستیش بەشێک لە منە و بەم تەعبیرە، هەر منم کە لە ژێر تەئسیری دەرەوەییدا شیعر دەخولقێنم. کاتێ جوانیی جوانێک بەچاو دەکەم تەنانەت کاتێ رژدی و ناحەزی پێشی دیتنی جوانیم لێدەگرێ، کاتێ ڕووداوێکی دڵتەزێنی کۆمەڵایەتی ڕوو دەدات، نیازێکی ڕۆحی بۆ شیعر گوتن هەست پێدەکەم، تەنیایی زۆر و بێهاودەمیش ئەو هەستەم تێدا دەخولقێنن.

ئێستا ئیتر بارودۆخی شیعری نوێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆتە دیاردەیەکی گەلێ سەقامگیر و پڕۆسەکەی لە گەڕانەوە نایەت، گەلێک شانازی دەکەم کە ئەنجومەنە ئەدەبییەکان بڕەویان زۆرە. تەنانەت لە گوندەکانیش ئەنجوومەنی ئەدەبی خەریکی پێکهاتنن، ئێوارە شیعری زۆر بەڕێوە دەچێ، بە بۆنەی ساڵمەرگی شاعیر و نووسەرە کۆچ کردووەکانەوە، ئەنجومەن کۆبوونەوەی جوان دەگێڕێ و شیعر و چیرۆکیان تێدا دەخوێننەوە. گەلێک شاعیری بەتوانامان هەیە، هەندێکیان بەئەزموون و لێزان، هەندێکیشیان گەنج و خاوەنی داهاتووی باش، وەک فەرەیدوون میرئەحمەدی، کامبیز کەریمی، جەلیل جەلیلزادە، سیمین چایچی، کولسووم عووسمانپوور،، بەیان عەلیڕەزایی، فاتیمە فەرهادی، ڕەحیم لوقمانی، محەمەد فاتح محەمەدی و.... زۆرێکی تر لە ورمێ و مەهاباد و سنە و کرماشان و ئیلام و سەقز و مەریوان و هەندێ جاریش تاران و شوێنی تر گۆڤار و ڕۆژنامە بڵاو دەکەنەوە کە دەورێکی زۆریان لە پەروەردە کردنی شاعیرە لاوەکاندا هەیە. بە گشتی شاعیری کچ و کوڕ شانبەشان بەرەو پێشەوە دەچن.

لە شاری بۆکان بارودۆخ گەلێک باشتریشە، شاعیرە لاوەکان گەلێک چالاکن، بێئیدیعان و کار باش دەکەن، وەک ئەمین گەردیگلانی، یۆنس ڕەزایی، محەمەد ئەحمەدی "ساماڵ"، خالید عینایەتی، نادر نیروومەند، ئەمیر ئەفسوون، جەواد حەیدەری و گەلێکیتر کە لە بواری شیعردا زۆر چالاکانە بەرەو ئاسۆی روون دەڕۆن.

## ناتەبا

زەردەپەڕی ئێوارێیە
لە شەپۆلی شەقامێکی فێگرتودا
مەلە دەکەم
دڵە خورپەیەکی کۆن
پشووی لێ بڕیوم

***

نیوەشەوە
دەستم بۆ خۆشەویستی دەگەڕێ
چرای ژوورەکەم
وەک چرای دڵم لە کووژانەوەیە
گەرووی هاوارم وشکە
خەونی کاڵ دەبینم
هەموو دنیام پێ تەنگە
بە پێشوازی گومانەوە دەچم

***

نیوەڕۆیە
وڵات کز و ماتە
دەشتی دەستەکانم تینوویانە
جامی دڵم پڕە لە هیچ

پرسیار لە سەر پرسیار مێشکم دەجوون
ژانێکی سارد
وەک کێردێکی ڕق ئەستوور
دەمشەمزێنێ
نەختە نەختە هەڵدەقرچێم
وردە وردە وشک دەبم

***

شەو بە بەریەوە نەماوە
جۆلانەی گومانێکی لەمێژین
هەوری لاری بەیانی دەچریکێنێ
روانگەم رووناک و بەرینە
لەشم پڕە لە ڕەشبەڵەک

من لە کوێم؟
لەکوێوە هاتووم؟
لێرە چ دەکەم؟
بە دوای کام پرسیاری بێوەڵامدا
وێڵم؟
ئەم جیهانە بەرینە
چەندە بەرتەنگە؟

لەندەن ۲۰۰۰

## لوتکە و سرتە

ناسنامەی من
چوار لاپەڕەی نالەبارە و
بە ناسنامەنووس گوتراوە
بەتایبەتی پەڕەکانی ڕەش کاتەوە
لاپەڕەی یەک
وێنەیەکی خێچ و خوارە لە زمانم:
"صمٌ بکم".
لاپەڕەی دوو هەر دێڕێکە:
گوێچکەت دەبێ کپ بێ و نەبیەت.
لاپەڕەی سێ بریتییە
لە لێوێکی ڕەشی قامک لە سەر
کە لە ژێریا

بە خەتێکی یەگجار خۆشی میرزایانە
نووسراوە:
ئەی خاوەنی ئەم ناسنامەیە!
ئامۆژگاری هەر جارێکە و
ئیتر دووپات نابێتەوە:
تاڤگەت نیگات دەبێ لێڵ بێ و
شینە شیعریش دەفتەرەکەت بڕەنگێنێ.
لاپەڕەی چوار
هەر سپییە و وا بزانم
دایانناوە بۆ ئەو کاتەی دەبێ بمرم
کە بینووسن ئەوەی خۆیان پێیان خۆشە.
بەڵام ئەمن، ترس و لەرزم وەلا ناوە و
بە خەتی خۆم
لێم نووسیوە "چاوەڕوانی".
بۆوەی ئەگەر هات و رۆژێک
پەڕەسێلکە جوانەکانم گەڕانەوە و
یەک دوو بزەی ئاهوورایی لە سەر لێویان هەدای دا
هێلانێکیان بۆ ساز بکەم
لە شابسکی بزە و گزنگ
داوەتێکیان بۆ پێک بێنم بە تەپڵ و نایە و تووزەلە
کاتێ هات و منداڵیان بوو
ناویان بنێم "چرپە" و "چۆپی" و "سۆما" و "سەما" و
بە پێنووسی خۆشەویستی
لەو لاپەڕە بیاننووسم

***

بڵێی ڕۆژێک زەردەی شەبەق
دیسانەکە لە سەر داری هیوام
جێ خۆش بکا؟
بڵێی ڕۆژێک گەرووی بەیان
شەوەزەنگی سارد هەڵلووشێ و
لە کازیوە تێپەڕ ببێ؟
بڵێی ڕۆژێک سەرنێزەی خۆر
لە نێو جەرگی دێوەزمەی زۆر
هەڵچەقێت و
کوندی گرژی وەیشوومەی خەم
لە کەلاوەی زامەکانم بتارێنێ؟
بڵێی ڕۆژێک ....؟

**لەندەن ٢٠٠٠**

## بەهاری٢٠٠٠

دنیایەکی بێبزەیە
باڵی هەناسە بریندارە
هەنیسکی پەژارە، زەوی دەکێڵێ
شار دارماڵی خەمە
گوند بێ زەماوەندە
زێ، زەریا دەخوا
جۆگەلە رووبار قوت دەدا
خۆری هەڵبەست، دەستەو ئەژنۆ
هەڵترووشکاوە

***

وڵات خەماژۆیە
مانگ ئاگای لە ئەستێرە نییە
دەشت و دەمەن لە یەکتری نامۆن
تاریکی سنگی رووناکی هەڵدڕیوە
زگی هەور منداڵی لە بار چووە
بەیانییەکان، پێناکەنن
ئێوارێکان ماتەمینن

کەژاوەی رۆژ

لە تەپومژی ئێوارێی سەخڵەتدا

خنکاوە

سەر پەنجەی شیعر زووخاوی لێ دەتکێ

رووبار شەکەتە

دارستان فرمێسک هەڵدەوەرێنێ

تەمی خەم باخی داپۆشیوە

ژەهراو، جێگای بە شەکر تەنگ کردووە

***

ژیان تاڵە

شەمشەمەکوێرە

چرای رووناکی دەشکێنێ

پشیلەی چڵێسی بێ چاو و ڕوو

هێلانەی قومرییە خۆش رەوتەکان دەپشکنێ

کوندەبووی پیری زلکوێر

لەسەر دیواری کەلاوەکان

دەستنوێژ دەشوا

***

ناڵەشکێنە کز و ماتە

هێزی ئەژنۆی نەماوە

حەوزە گەورە تینوویەتی
چاوی بە مۆلەق وەستاوە
قەڵای سەردار قەڵاچۆیە
دووکەڵ هەموو لەشی تەنیوە
"باغی میراوا" گەشە و نەشەی نەماوە
کیژۆڵەکان زەماوەندی لێ ناگرن
"گۆمی سەرسەکۆ" لە گەنداوی خۆیدا پەلەقاژەیەتی و
سەمفۆنیای بۆقە چاو سەوزەکانی نایەتە گوێ
شەمامەکانی "مەحمووداوا" لە گێژاوی نامۆییدا
لارەشەیان گرتووە
دار گوێزەکانی "ئاجیکەند" لە بارانی خۆشەویستی تەریکن
بڵاڵووکەکانی "سەردەراوا" کرمۆڵن
دۆڵی کۆڵوانکە شینی "خۆراسانە"
لە تاسەی دووری ئازیز ویرە دەکا
غاری "سەهۆڵان" لە میوانەکانی نامۆیە
"تەرەغە" لە عازیەتی هەژاری موکریانی
وڕێنەی مەرگیەتی
***
هەناسەی دڵنیایی قورسە
بووک، دەموچاوی لە بێ ئاویدا دەشوا

زاوا، لە شەپۆلی بێوازیدا خەونی وەنەوز دەبینێ
ئاهوورا تازیەبارە
ئەهریمەن لە هەڵپەڕکێدایە
چرای سەبووری خامۆشە
هیچ گۆڕێک کێلی نییە
برا قەبری برا ناناسێتەوە
گزنگی بەیان پەیامی پێ نییە
کوورەی بوختان بێوچان
گێژەڵووکەی هاوار دەدەمێنێ
منی تینووش
لە شۆرەکاتی بیرەوەرییەکانمدا
دەتلێمەوە و
لە کامووسکی رەشی خۆمدا کلوو کلوو
وەک بەفری بەهار دەتوێمەوە

بۆکان

## گڵکۆیەکی موبارەک

ئیتر گڕ لە ژیانم بەرنادەم
ئیتر چزە لە هەستم هەڵناستێنم
شیوەن و رۆڕۆ لە فەرهەنگمدا ناگونجێنم
بیر لە شەوە داهێزراوەکان ناکەمەوە
چاوم لە فرمێسکی پیر پڕ ناکەم
ئیتر لاپەڕەی دەفتەرەکانم
لە ناڵە و نرکە سەررێژ ناکەم
باسی ئەشکەنجە و ئازار بە زمانمدا نایەنم
بە ئێوارێ خەمینەکانەوە خۆم خەریک ناکەم
ئیتر تامەزرۆی شەڕابی مەرگ نابم
زەماوەندی نادیار بەدی ناکەم
پەستا پەستا
لێوم ناکرۆژم
بە قسەی هیچ و پووچ
خۆم وەک بەفری بەهار ناتوێنمەوە
لەمە بەو لاوە
هەڵدەکوتمە سەر ئاوازە نەرمەکانی بەهار
ماڵی شەو گەسک دەدەم و
گۆرانی بۆ گزنگ دەڵێم

لە گەڵ خۆشەویستی دەستەملان دەبم
شیعری جوان لەبەر دەکەم
شەو و رۆژ
لەگەڵ گۆوەند و زەماوەند ئامراز دەبم
ساتی عەشق
پرسیاری مانگە شەو
شەوی ژوان
بۆن و بەرامە ی ماچ
دەستچن دەکەم
سەمای ئاسکە سڵەکانی بازنە لە قۆڵ
سەرچۆپیی شەنگە ژنی هەوری لە کۆڵ
دەنووسمەوە
هێزی "با"
رووپەڕی "ئاو"
هەڵدێری "چیا"
شەپۆلی ئوقیانووس
ئەستێرە ی جوانی خەیاڵ
مانگی دەم کەل وەبیر دێنمەوە
ئیتر بیر لە یەکەمین خایەنی ئەم سەرزەوینە[1]
ناکەمەوە
کە بۆ چنگێ گەنمی نەبژێردراو
ئەم جەهەننەمە بەرینەی بۆ ئێمە بە دیاری هێنا
***

---

[1] ئادەم

فرووغ و فەرەیدوون و نیما یووشیج
سۆراب و نوسرەت و سیمین بیهبەهانی
مەولەوی و گۆران و حەزرەتی نالی
سوارە و مارف و ژیلای جوانە مەرگ
دێنمەوە کایە
خاکی گۆڕەکەی ئوخما توڤەی[1] قژ کاڵ
تۆزی گڵکۆ موبارەکەکەی شاملوو
لە دەموچاو هەڵدەسووم و
شیعرە ئاراستەکانیان دووبارە دەخوێنمەوە
قسە نەستەقەکانیان دووپات دەکەمەوە
باسی شەوبۆ و شاناز و پێناز دەکەم[2]
کە ڕایەڵ و پۆم لەگەڵیان تێکەڵ بووە و
بە تاریکیش چاوم لە چاویان گرێ داوە
***
زامی حەسانەوە قووڵە
کڵپەی ئاگر دانامرکێ
بڵێسەی هەڵبەست کڕنۆش نابا
سەرپەنجەی ناسکی شیعر نانووشتێتەوە
٦٠ مۆم دادەگیرسێنم
بۆ ٦٠ پایزی پڕ لە شەختە
٦٠ غەزەل دەنووسمەوە
بۆ ٦٠ ساڵ ئازاری تەمەن

---

[1] شاعیرێکی ناسک خەیاڵی رووس
[2] هەوێنی شیعرەکانم

٦٠ چوارینە لەبەر دەکەم
بۆ ٦٠ بەهاری لە دەستچوو
***
شەقامە نیوە چۆڵەکان پشوو دەدەن
کۆڵانە قوڕاوییەکان نەفرەت دەشۆنەوە
بیرەوەرییە ناتەواوەکان
لە شوێنەواری کاکەشاندا
سەر بە سەری یەکەوە دەنێن
باڵدارە دڵدارەکان
قۆڵ لە قۆڵی یەکتری دەکەن و
بەرەو دنیایەکی تازە
هە
نگاو
هەڵد
ێننەوە

*بۆکان*

## گوڵە جەهەننەمی

خەمێکی ڕەش
بە بارتەقای باوەڕ
لە ئیسکەکانمدا
گۆرانی دەڵێ
جاری وایە
پێنووسەکەم نانووسێ و
کاغەز لەگەڵم هامڕاز نابێ
جاری وایە بۆ تاقە گوڵێکی زەنبەق
دەشت و دەوەن لێک دەدەم و
بە چاوی دڵ
هەرچی جۆگەلە و ڕووباری جوانە دەیکێڵم
بەڵام غەیرەز گوڵە جەهەننەمی
هیچ گوڵێکی‌تر
چاو لە چاوم گری نادا
جاری وایە پێڵاوی نووسراوەکانم
لە وشکایی سەرەنگرێ دەدەن و
لە باراندا هەڵدەخلیسکێن
*مەرگ*
*لە تابووتێکی رەشدا خۆی حەشارداوە و*

*هەر تاو نا تاوێ*
*لە پەنجەرەیەکی ژەنگاوییەوە*
*مۆرەیەکم لێ دەکات*

ڕۆژگار
شێوازی کوشتاریشی لێ سەندووم
کوشتاری خۆم
کوشتار لە گرێ پووچکەکانی درۆ و دەلەسە

لە هیچ شوێنێک ئۆقرە ناگرم
لە هیچ زەماوەندێ دڵم ناکرێتەوە
بزە بە هەڵکەوتیش بەلامدا نایە و
ئەگەر ڕێگەی لێ هەڵە بێ و
بەم لایەدا تێبپەڕێ
چاوە بزەیەکم لێ دەکات و غەیب دەبێ

من تەمومژی ئێوارانی سەخڵەتم و
لاپەڕەکانی ژیانم
سەرڕێژن لە نهێنی
من تەموورەژەنێکی خەو لێشێواوم
کە لە سووچێکی خەڵوەتگاکەمدا
خەریکی مناجاتم و
لە تاڵی تەموورەکەم
خوناوەی عەشق و عارەقی پێنەگەیشتن دەتکێ

من پەیکەرەیەکی سەهۆڵێنم
لە بێستانێکی زەرد هەڵگەڕاودا
کردوویانم بە داوەڵ و
لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر دەتوێمەوە
من لە شەوەزەنگێکی خەماژۆدا
لەدایک بووم و
پێش ئەوەی هەناسەی کازیوە هەڵمژم
لەژێر ڕێژنە بارانەی تەنیاییدا
خنکاوم

****

وشەکانم بێوازن
نووسراوەکانم شڵەژاون
پێنووسەکەم شەکەتە
شیعرەکانم دووگیانن
باوەشم جۆلانەی دەیان واژەی کرچ و کاڵن
کە هەر بینا لە کۆڵانی دێڕەکانی خۆیاندا
سەریان لێشێوا و
لە شەپۆلی بێکەسیدا
بوونە پێخۆری ماسیە برسییەکانی زەریا

***

لێواولێوم لە تاسە و
پڕپڕم لە هەناسە

## باوەڕی تازە

هەستم، دەخەمە چوارچێوەی هەڵبەستم و
لەسەر ڕووبارێکی بەرین
بە شەپۆلی خەیاڵ
دەستنوێژ تازە دەکەمەوە
لە ئامێزی دەشتێکی وەنەوشەییدا
هەر دوو دەستم هەڵدێنم و
نوێژەکەم بە قنووت دادەبەستم
لەگەڵ خودای خۆم تێکەڵ دەبم
بە تەسبێحە قەزوانەکەم
دەنک دەنک
تاسەکانم دەهۆنمەوە
پاش ماوەیەک
لەبەر یەکیان بڵاو دەکەم
من لە بیرێکی تازە
لە باوەڕێکی تازە
لە ڕوانەوەیەکی تازە دەگەڕێم

***

بە موبارەکی سەبای ساڵحان
بۆ دیتنەوەی سەرچاوەی ژیانێکی نوێ

له بەرزەخی بێوازی و بێدەنگی تێدەپەڕم و
ژاری ژانی برینه ساڕێژ نەکراوەکانم
لەدڵ دەشۆمەوە
تۆزی کۆنی جێ پێی نامۆییەکان
له خۆم دەتەکێنم و
هەنگاو بە هەنگاو بە کتێبخانەکاندا دەگەڕێم
گۆڤارێکی نوێ
دەبینمەوە و
بۆ وە دەست کەوتنی بەرهەمێکی نادیار
لاپەڕەکانی شەق دەکەم
من له هەستێکی تازه
له هەواییێکی تازه
له شێوازێکی تازه دەگەڕێم
***
بۆنی گوڵەباخەکان هەڵدەمژم
سەمفۆنیای گوڵاڵە سوورەکان دەگرمە گوێ
خشپەی گەڵای شۆڕەبییەکان
دەکەمە گۆرانی و
بە ئاهەنگێکی کەس نەبیستوو
هەوری لارێکی جێنەکەوتوو دروست دەکەم
من له هەتاوێکی تازه
له دنیایەکی تازه
له چریکەیەکی تازه دەگەڕێم
***

ئەوەی سەرنجم ڕادەکێشێ
خاڵێکی ڕاستەقینەیە لە بوارێکی ڕووناک
کە لە ناو چپە و سرتەی ڕوانینی شیعرەکانمدا
بەرهەمێکی تازە دەخولقێنێ
بەرهەمێک، کە لە "چەندە بژی" بێزارە و
بۆ "چۆن بژی" سەر دادەنەوێنێ
من لە ئاسمانێکی تازە
لە مانگێکی تازە
لە ئەستێرەیەکی تازە دەگەڕێم

***

ئاگری بیرەوەری لە دڵمدا هەڵایساوە
کێو و شاخە بەرزەکان دەپێوم
جادە دوورە دەستەکان دەپێوم
جانتای ڕێبوارە ماندووەکان دەپشکنم
لە کازیوە تێدەپەڕم
شەبەق دەگرمە ئامێز و
کڕنۆشێک بۆ گزنگ دەبەم
من لە سنوورێکی تازە
لە هەوارێکی تازە
لە ئاسۆیەکی تازە دەگەڕێم
من لە شیعری تازە دەگەڕێم

## شەو

شەوە، شەوێکی ڕەش
شەوێکی سارد و سڕ و بێ ئەستێرە
لە گەرووی ئاسمان خەم دەبارێ و
لە سنگی زەوی وەرهەم باڵا دەکا
قاقا، سەڵای مەرگە و
پێکەنین، شین
روو لە هەرلایەک دەکەی، نامۆییە

***

منالان مات و کڕ
لاوان بێدەنگ و سڕ
پیرەپیاوان دەستەو ئەژنۆن
دەنگی کوندەبوو دیواری ئەوین دەڕوخێنێ و
باڵی شەمشەمەکوێرە
چرای ڕووناکی دەشکێنێ
نە چریکەی بازێک بۆ ڕاپەڕین
نە هاشەی هەڵۆیەک بۆ ڕاچەنین
نە هەڵبەستی هونەرمەندێک بۆ بزووتن
هەموو لە ژێر لێفەی تەنبەڵی خزیون و
خەون دەبینن.

***

تا چاو هەتەر دەکا، تاریکییە
گوللەیە، سێدارەیە، ماڵئاواییە
بە زەردەخەنەم
بەڵام دەگریم
دیوانی شیعرەکەم یاساغە
دەبێ بە زمانی غوربەت بدوێم
کتێبخانەی شارەکەم سووتاوە
قوتابخانەی وڵاتەکەم ڕووخاوە
قەبرستانی باب و باپیرم خاپور کراوە
نوسراوەکانم لە دار دراون
ئێمە ئاسۆی بێ شار،
زاوای بێ بووک،
هەڵۆی بێ دوندین
پەڕ و باڵمان هەڵپڕووزاوە
سەرمان لێ شێواوە
هەموو شتێکمان لێسەندراوە
بەڵام بەم حاڵەش چۆک دانادەین
بۆ هیچ کەسێ چۆک دانادەین
بۆ هیچ کەسێ کڕنۆش نابەین
دەستی هیچ کەسێ ماچ ناکەین
قەسیدەی درێژ درێژ دەڵێین
مەشخەڵەکانمان دەگەشێنینەوە
گێلاس گێلاس شەڕاب هەڵدەخەین

بە گژ زللەدا دەچین
توورەییەکان دەتوێنینەوە
لەژێر ڕێژنە بارانی بێئەماندا
سرود دەخوێنینەوە،
تەمووره دەژەنین
جەڵمان دەگرین
گۆرانی دەڵێین
سواری ئەسپی شێ دەبین
لە کازیوە تێدەپەڕین
سڵاو لە شەبەق دەکەین و
باوەش بۆ هەتاو دەکەینەوە

بۆکان

## دەنگی ماتەمین

دنیای من
دنیایەکی چکۆلە و سەرداپۆشراوە
لە ئێوارێی، دڵتەنگی و
لە شەقامی، بێدەنگی دەبارێ
گوڵی گوڵدانەکانی مات و مەلوول
گەڵای دارەکانی زەرد و مل کەچ
ڕووبارەکانی وشک هەڵگەڕاون
لە دنیای چکۆلەی مندا
هیچ ڕۆژێک
هێشووی هەتاو لە سەربانی ماڵان نالەرێتەوە
هیچ کاتێک،
ئاگری پێکەنین
لەسەر بانیژەکان ناگەشێتەوە
ترپەی نەفرەت
لە دەنگی پێڵاوی ڕێبوارەکان بەرزترە
گومانی نەمان، چەشنی باران
لە ئاسمانی بێ ئەستێرە دێتە خوارێ
شەونمی بەیان ئەوەندە لاوازە
بە ملی هیچ خەیاڵێکدا شۆڕ نابێتەوە

زەردەخەنە بە هەڵکەوتیش
لەسەر لێوی گەورە کچان جێ خۆش ناکا
کلی بێوازی
گلێنەی لاوەکانی سپی هەڵگێڕاوە
هەتاو بە ئاگری جگەرەیەک بریندار دەبێ
ئاهەنگی نوێخوازی
لە هیچ کۆڵانێک دەنگی نایە
***
لە دنیای سەرداپۆشراوی مندا
هەر بایە و سواری گڤە دەبێ
پەنجەی ناسکی پڕ لە ئەفسوونی "با" و
تاڤگەی سێحراوی نیگای "ئاو"
هەر ئەفسانەیە و هیچی تر
قاڵاوی ڕووڕەش، لە پەنای دیوارەکان
خۆی لە تەرمی کەو و کەوباڕ حەشار داوە
باڵی سامناکی کوندەبوو
ئاسمانی داپۆشیوە
شەمشەمەکوێرە
جێگای بە قومرییەکان تەنگ هەڵگێڕاوە
شمقاڕ بۆ ژوانی ئەستێرە
باڵەکانی هەڵخستووە
شەوەزەنگ
ئێوارێکانی لە جەڵمان خستووە
ئەسپی مەرگ سمکۆڵ دەکا.

***

حەیفە بە دەنگێکی ماتەمینەوە گۆرانی بڵێم
حەیفە بەو هەموو قەسیدەوە خۆم داگیرسێنم
حەیفە تاریکەشەوی لاسار
هەستەکانم بریندار بکا
حەیفە بە جێی ئەو هەموو نووسراوە بەکەڵکانە
وڕێنەی شیعرەکانم بنووسمەوە
حەیفە پڕوپاگاندا بۆ شیعرێک بکەم
کە سەنگەری نیە
شیعری بێسەنگەر پووچەڵە

***

با هاوارێک بۆ خودا بەرم
با سکاڵایەک لەگەڵ خودا بکەم
با جانتایەک هەنیسکی بۆ هەڵڕێژم
کە یەکەمین خایەنی ئەم سەرزەوینە
کە "ئادەمە"
بانگ کاتە بارەگای خۆی و
بیخاتە ژێر پرسیار و
بە تاوانی خەیانەت
لە پێش چاوی ئەو هەموو جوانە بێگوناهە
لە مەیدانی شار
بیدا لە دار
کە بۆچی ئەم خەڵکە زمان بەستراوەی
ئاوا تووشی خەم و پەژارە کرد؟

بۆ چنگێ گەنمی نەبژێردراو
ئاوا سەری لە عالەم شێواند؟
بۆچی سەرسامی پێگرتین و
کردینیە سوتووی جغارەیەک و
وەک تۆوی هەرێز
لەم دنیا سەرداپۆشراوەدا بڵاوی کردینەوە؟

## نەگەیشتن

شارێک نییە
شەوێکم لێ شەق نەکردبێ و
بازی چاوم
نێچیرێکی لەش کەروێشکی لێ نەڕفاندبێ
گۆوەندێکم پێشک نایە
ڕەشبەڵەکم لێ نەگرتبێ و
دەستی عەشقم
پەنجەی نەرمی مامزێکی لێ نەگوشیبێ
شەقامێکم نایەتە یاد نەمپێوابێ و
چپە و سرتەی ئەوینێکم لێ نەبیستبێ
چیا نەما لە باوەشی بەرینیدا
سەرخەوێکم لێ نەشکاندبێ
زەریایەکیش هەر نەماوە نەکەم سەیری و
بۆ ماوەیەک لە قەراغی دانەنیشم
بەڵام، بە هەموویان نەیانتوانی
بێشکەی دڵم ڕاژێنن و
بمبەن بۆ شاری ئەستێرە

هیچ کامێکیان بۆیان نەکرا
خەڵفی باغی شەونخوونیم پاراو کەن و
لە تەنیایی دەرم بێنن
هیچ پەنجەیەک قفڵی دڵمی نەکردەوە و
هیچ زەخمەیەک
سازی دڵمی نەخستە دەنگ
یادگارە بۆن خۆشەکان
لە چاومدا کاڵ بوونەوە و
هەر بە دڵم نەگەیشتم

****

شەقام پاکی کڕ و بێدەنگ
کۆڵان هەموو چۆڵ و بەرتەنگ
لە هیچ شوێنێک بڵێسەی عەشق پەرەی نیە و
گۆوەند هەستی خەستی هیچ دڵدارێک نابزوێنێ

****

بۆ کوێ دەچم؟
کێ دەمناسێ؟
کێیە ڕۆژێک دەستم بگرێ و
لە غەریبی دەرمبێنێ

*بۆکان*

*هەوێنی ئەم شیعرە لە شیعری "باوکی تارا" وەرگیراوە*

**(...)**

گرێ پووچکەی هۆنراوەکانم
بە هەزار ناری عەلی
لە گێژەڵووکەی ژیان دەردێنم و
پێش ئەوەی تووشی پشکۆی زام بن
لە درزێکی تاریکەوە
بە چنگ و ددان دەیانکەمەوە
لەبەر یەکیان بڵاو دەکەم
بەو هیوایەی بە هەموویان
بەرهەمێکیان لێ وەدی بێ، کە:
ئەم لا و ئەو لای گەڵا و گوڵ بێ
لەهەرلاوە تێی بڕوانی
شادەشتێکی بێ وێنە بێ و
سەرڕێژ، سەرڕێژ

لە گەزیزە و لە نێرگز و گوڵاڵە بێ
فرمێسکەکانی بکاتە جامێکی زێوینەوە و
بە دوای جێ پێی تاریکیدا بیانڕێژی
باغەوانی بۆن خۆشترین
شەوبۆ و شەمامە و شۆڕەبی بێ و
بێشەڵانی هەڵاڵەکان پێشێل نەکا
بزەکانی بۆنی هەتاو بدا
هەر ساتێکی بەشێک لە پشکۆی ئیلهام بێ
لە نێو تەپومژی ئێوارێیەکی خەماژۆدا
کۆلکەزێڕینە وەدی بێنێ
لە تاریکی دانەچڵەکێ
لە دەستی چڵکنی شەو نەسڵەمێتەوە
سنگی قەڵغانی تەلیسمی
دەروازەی قەڵای مەردان بێ
منیش هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشم و
پاڵ بدەم بە دارتووە کۆنەکەی
ساڵانی پێش لە دایک بوونم و
ماندوویەتی خۆم وەحەسێنم
بەڵام هەزار و هەزار مخابن
کاتێ بە خوێنی جەرگ و بزڕ بزڕ کردنی نینۆک

گرێپووچکەکانم بۆ کردنەوە
هەر کە چاویان بە ڕووناکایی کەوت
دەست و پێی خۆیان گوم کرد و
دەستنوێژی جیا بوونەوەیان گرت و
هەریەک بە لایەکدا بۆی دەرچوون
پێیان وا بوو هێندە بە عەقڵ و مشوورن
کە لە پڕ دەگەنە سەر لووتکەی ئاوات و
خۆیان لە ئاسمانی ئارەزوو توند دەکەن
بەڵام ئاکام؟
یەکیان خۆی بە شمشاڵژەنێکی ناشارەزاوە
هەڵاوەسی و
هەر کە گرمەی دەهۆڵ و
فیقەی زۆڕنایان بیست
لە خود بێخود بوون
یەکیان سەری لە چۆڵ و بیابان دەرێنا و
بە گەڵای دار بژیوی کرد
بە تەرزە توونیەتی خۆی شکاند
لە گەردەلوولی دووکەڵی پێنەگەیشتندا
سەری لێشێوا و
شوێنەواری عەشق و عاشقی لە بیر چووەوە

یەکیان چووە ژێر لاشە بەردێکی زەلامەوە و
باوەشی بۆ باران کردەوە
شەوانە ئەوەندەی لەگەڵ ئەستێرەکان
چاوبڕکێنە کرد
کە دوای ماوەیەک چاوەکانی
هەر شتێکی دوان‌دوان دەدی و
هەر بەو دەردەش سەری ناوە
یەکیان بە گوڵە هەرمێ
کەپرێکی دروست کرد و
لە لق و پۆپی دار گێلاسێک
جێگاوبانێکی هۆندەوە و
لە شەوە بێ مانگە شەوەکاندا
دەستەو ئەژنۆ دانیشت و
بە زگی برسیەوە بۆنی پێخۆری هەڵمژی
کە لە ئاکامدا گورگێکی برسی
دڵی پێی سووتا و باوەشی پێدا کرد و
لەگەڵ خۆی بردی
یەکیان بە هەڵبەز هەڵبەز و قاقا کێشان
خۆی بە دەشتی کارمامزەکاندا دا و
وەهایان لەگەڵ تێکەڵ بوو

کە ڕەنگ و ڕووی ئەوانی گرت بەڵام
هەرگیز ڕەوت و ڕێگا ڕۆیشتن و
ئاوڕدانەوەیان لێ فێر نەبوو
یەکیان سەروبابانی خۆی لە خومرە نا و
وەها لەگەڵ شەڕابی کۆن بوو بە هەڤاڵ
کە دەتکوت بووە بە نەوە و نەتیجەی بادە و
هێندە شەوانە خەونی پڵیتی دی
کە شەوێک لە نێو خەونە ئاڵۆزەکانیدا
سەری بۆ هەمیشە تێداچوو
دەنگم لە کۆڵانی بێدەنگیدا
دەنگ دەداتەوە
لە سەرتاپای لەشم
عارەقی گومان دەتکێ

****

دەنگێکم هاتە گوێ
دەنگێکی لاواز سەرنجمی بۆ خۆی ڕاکێشا:
ئەی من؟
بۆ ئەم گۆشتە لەو ڕانە نییە؟
بۆ من ڕیشەی هۆنراوەکانی تۆ نیم؟
تا ئاوڕم داوە واقی وڕ مام

ڕیشەیەکم چاو پێکەوت
کە لە بەر بێوازی و بێدەسەڵاتی
لە خێڵ دوا کەوتبوو
چاوێکی مۆڕ کردەوە و دەستی کرد بە خۆ بادان
دەمەلاسکەیەکی لێ کردم و گوتی:
منیش منم
منیش هەر تانوپۆی ئەو ڕیشەیەم
منیش بۆ خۆم دنیایەکم هەیە
منیش هەزار واژەی جۆراوجۆرم هەیە
منیش لە جانتاکەمدا
هەزار گوڵە پاییزەم پەروەردە کردووە
لە پڕ گەردەلوولێکی توند هەڵیکرد و
بێوەی ئەمان بە کەس بدا
چاوی خۆی قوچاند و
دەشت و دەری پێکدادا
ڕیشە بێکەڵکەکانی وەپێش خۆی دا و
بردی
هەندێ واژەی بێتامیش
کە خۆیان لە پێچ و پەنادا حەشار دابوو
تەفروتونا بوون

وشە مەجازییەکانیش هەرکام لە حاستەوخۆ
توانەوە
واژە ئاراستەکانیش
لەگەڵ وشە بە تام و بۆنەکان
بە چاو لێکدانێک باڵایان کرد و
دەستیان کرد بە گۆرانی کوتن
هەوەڵ مەقامیان ئەڵڵا وەیسی بوو
داوای ماندوو حەسانەوەیەکی کەموکورت
باسەکەیان هێنا سەر شیعر و هەڵبەست
کە زۆربەیان لە چوارچێوەی
غەزەل و قەسیدەدا بوو
بەڵام زۆر زوو
کەوتنە سەر بیروڕای نوێ و
خۆیان بە بەژنی خوایەکی تازەوە هەڵاوەسی
خوێنی شیعرەکانیان لە قەڵەشتی عەرزەوە
هێور هێور گەیاندە زەریا
زەریایان سوور هەڵگێڕا
توند و تیژ و نەسرەوتوو
بە سرتە سرت و چپە چپ
مەلایکەکانیان لە خەو ڕاپەڕاند

سواری ئەسپی شێ بوون و دەم لەسەر پشت
وڵاتەکانیان کوتا و
بە زەنا زەنا و هاوار هاوار
گەڕەکیان شێواند
جڵەوی ئەسپەکانیان بە ددان گرت و
لە سەر لووتکەی چیا دووردەستەکان
جێیان بۆ خۆیان خۆش کرد
بە دەستێکیانەوە ئاوێنەیەکی تەواو باڵا و
بە دەستەکەی تریان دەیان ئەستێرەیان
هەڵاوەسی و
لەگەڵ هەورە کۆچەرەکان بوون بە هەڤاڵ
بە قووڵایی ڕۆحیان، دەلاقەیەکیان
لە پەنجەرەی باوەڕیانەوە کردەوە و
بە پەنجە ئەفسوونەکانیان
دەیان پەڕەسێلکەی سپیباڵیان
لە بەر درگای هەناسەیان کۆ کردەوە و
ئاهەنگی حەسانەوەیان بۆ ساز کردن
یاکەریمە خۆشڕەوەکان لەسەر لەپی دەستیان
دەستیان کرد بە چینە کردن
هێشووی قامکیان وشەی ڕەنگاوڕەنگی

لێدەتکا
باڵنجی لێویان
واژەی کەس نەبیستووی لێخەوت
کوندەبوویان تاراند و ڕێگایان لە
شەمشەمە کوێرە بەست
پەرییە قژ زەردەکانیان خستە جەڵمان
بۆنی ڕێحانە و سووسەنبەریان بڵاو کردەوە
بە بادەی کۆن بەرهەمی تازەیان خوڵقاند
شیعری تازەیان خستە باڵەپڕژە

***

کورتە شیعرێک
بە باڵای کتێبەکانمدا هەڵدەچێ.
کورتە شیعرێک:
بە بۆنی گزنگ و هەتاوەوە
بە بۆنی نارنج و لیمۆ و پڕتەقاڵەوە
بە بۆنی بزوتنەوەوە
عەتری کورتە شیعرەکە
کتێبخانەکەمی داگرت
بیرە کۆنەکانی گەسک دا
منیش ئارام و لەسەرەخۆ
تانوپۆی ویستەکانم
خستە چوارچێوەیەکی زێڕینەوە و

به دیوارەکاندا هەڵمواسی
گوڵە نەپشکوتووەکانم خستە پێکەنین
باوەشم بۆ شەبەق کردەوە و
لەپی دەستم پڕ کرد لە هەستی تازە و
هەتا توانیم هێشووی گێلاسم کۆ کردەوە و
بە هەموو توانام چریکاندم:
ئای... شۆڕەسوار
شۆڕەسواری ڕێگەی نەجات
شۆڕەسواری ڕێی ئازادی
هەتا لووتکە کەمی ماوە
کەمێک توندتر
کەمێک توندتر
کەمێک:
ت
و
ن
د
ت
ر

## پەڕپەڕکراو

لە دووری تۆ وەها دڵهەڵکزاوم
کە خوێن دەڕژێ لە بینایی دوو چاوم
بە ڕۆژ، بێبەش لە دیداری عەزیزان
بە شەو تەنیا و بێکەس، دڵ شکاوم
جەرگ سووتاو و بێدڵدار و دڵسۆز
نەماوم، ئارەزوویێکی نەماوم
بریندار و ئەسیری داوی بسکت
تەماشا ڕەش بووە، جەرگ و هەناوم
نە دەنگم دێ نە سۆزم دێ نە هاوار
پساوم، تاڵی تارێکی پساوم
لە دوایێنی چیا، شەونم دەڕێژم
لە کێوان، ئاخرین شوعلەی هەتاوم
بە مەرگی تۆ، منیش گوڵ بووم و بۆن خۆش
گوڵم لۆمەم مەکە، پەڕپەڕ کراوم
وەرە بەو پەنجە نەرم و ناسکانەت
دەوا کە دەردەکەم دەردت لە چاوم
"وەفا" عەشقی ئەتۆ کردی بە شاعیر
دەنا کەس نەیدەزانی نازناوم

١٣٤٤/٥/٤

## خاچ

ئەمن "لۆقا"، ئەتۆ "عیسا"ی مریەم...
ئەمن پڕ زام و تۆ دەرمان و مەڵحەم
ئەگەر کاتێ لە جێیەک خاچ ئەبینم
دەلەرزێم و، دەسووتێم هەر وەکوو شەم

تەنگی بانگی شێوانی "یەکشەممەیە"
لە سەر تەختێکی ڕەقی بە پەتۆ داپۆشراو
لە نەخۆشخانەیەکی تاسەباری بێبەندوبار
ڕاکشاوم
گێژ و وێژ و ڕەنگ هەڵبڕووسکاوم
ڕوانگەم تەنیا گومبەزی کلیسایە و هیچی تر
بۆنی ئەلف و بێی نەخۆشخانە
مێشکی سەری هەڵگرتووم
کەللەی سەرم وەختە شەق بێ
هەوای ژوورەکەم وەک قورقووشم قورسە
بە شەو دەستم بۆ ڕووناکایی دەگەڕێ و
بە ڕۆژ تاریکایی بژار دەکەم

بانگ و سەڵای مەرگ و نەمان

پەژارە و شیوەن و گریان

دەستیان لە دەستی یەک گرێ داوە

دوکتۆرەکان دێن و دەچن

پەرستارەکان

بە باوەشێک دەرزی و دەرمانەوە

بە دوویانەوەن و

چیرۆکی نەخۆشخانە دەنووسنەوە

ساغ و نەخۆش شان لە شانی یەکتر دەسوون

هەرچی دەیبینی

ڕەنگ زەرد و لێو بەبارە

هەرچی دەیبیسی

سەمفۆنیای خۆ ڕنین و قوڕ پێوانە

دایک کۆرپەی لە دەست داوە و

ڕۆڵە بابی لێ کوژراوە

***

ڕوانگەی ژوورەکەم تەنیا کلیسایە و بەس

کلیسای نەنە مریەم

بەناوبانگترین کلیسای ئەم هەرێمە

زۆربەی مەسیحیەکان یەک یەک و دوو دوو

ئارام و لە سەرەخۆ
ڕێکوپێک و پاک و خاوێن
بە نەزم و نیزامێکی تایبەتی
ڕوویان کردۆتە کلیسا
نە ئوتووی شەڵوارەکەیان تێکچووە
نە گرێی کراواتەکەیان شل بۆتەوە
لەبەر درگاوە،
کڕنۆشێک بۆ کلیسا دەبەن و دەچنە ژووریٚ
گومبەزی کلیسا زۆر بەرزە و بەتایبەت
خاچی لووتکەکەی بە ڕاکشانیشەوە لە من دیارە
من خەونی ئاڵۆز زۆر دەبینم
بەڵام تامەزرۆی خەیاڵ نیم
ئەوە، خەیاڵە کە تامەزرۆی منە و
دەستم لە یەخە ناکاتەوە
ڕاستی عیسایان بۆچی کوشت؟
ئەویش بەو هەموو ئەشکەنجە و ئازارەوە!
عیسا چی کردبوو؟ چی گوتبوو؟
غەیرەز ئامۆژگاری و ئاکاری جوان
چ بیدعەتێکی بە جیٚ هێنابوو؟
پەککوو چەندە سەختە ئامۆژگاری

بۆ ئوممەتی نەفام!
دەڵێن تێر قەت برسی خۆش نەویستووە
چونکوو تێر هەمیشە لە برسی ترساوە
ترساوە ڕۆژێک بەرۆکی بگرێ!
لێی ڕاستەوە بێ! بیکووژێ!
هەر لەبەر ئەوە چاوی بڕوایی نادا بیبینێ
ئەوانیش لە عیسا دەترسان
بە تەواوی وجوودیانەوە دەترسان

***

بە بڕوای زۆربەی مەسیحییەکان
عیسا کوڕی خودایە و
لە عاسمانە و نەمردووە
لەسەر ئەو بڕیارەش سوورن
من زات ناکەم ئەم قسانە دووپات کەمەوە
چون خودا زاتە و
زاتیش نە لە کەس دەبێ و
نە کەسی لێ دەبێ
عەقڵم ئەم قسانە ناسەلمێنێ
دەنا نە ئاسمان کوێرە و نە زەوی کەڕ
ئاو لە چاڵێکدا بمێنێتەوە بۆگەن دەبێ

قسە، زۆری دووپات کەیەوە بێتام دەبێ

هەموو شەوێ لە بەر مانگەشەو دانیشی،

دەبێزرێی

منیش خەڵکی وڵاتی کوردستانم و

لە کوێستانەکانی ئەو وڵاتە جادوییە

لەدایک بووم،

لە مەڵبەندی ناڵەشکێنە و ئەربەبا و قەندیل

چاوم پشکووتووە

لە ئەنگووستە چاوی "خەوەبەردینە"ی "سوارە"

لە سیحری سپی شیعرە ناسکەکانی "نووری"

لە پێشەنگی کەژاوەی "کەو"ی "ئاوات"

لە دەنگی شانەی شیعرە خەم ڕەوێنەکانی "هێدی"

لە هەوارگەی ژوانە خەیاڵیەکانی حەسەن زیرەک

لە پێچ و پەنای برینە سارێژ نەکراوەکانی عەشق

پێنووسم بە دەستەوە گرتووە

هەربۆیە بەم قسانە باوەڕ ناکەم

هەربۆیە لەسەر بڕیارەکانم ئاوا سوورم

***

ئێستاش شەو و ڕۆژ کارم نووسینەوەی ڕابردووە

ڕابردوویەکی خەیاڵاوی کە هەرگیز ناگەڕێتەوە

هەر وەک نیگای نازدارێکی شۆخ و شەنگ
هەر وەک لەنجەی قومرییەکی بە عاتیفە
هەر وەک ئاوڕدانەوەی ئاسکێکی سڵی ماندوو

***

سڵاوێکی گەرم و گوڕ لە عیسا
لە عیسای روحوڵڵا
لە عیسا و ئاکارەکانی
لەو پێغەمبەرە هێدی و هێمنەی
کە بە ڕۆژی ڕووناک بە چوار مێخ کێشرا و ناڵەی نەکرد
لەو پێغەمبەرە گەورەیەی
کە نە قینی لە کەس هەڵگرت و
نە تۆڵەی لە کەس سەندەوە

*وارمێ*

## تاوێرە بەرد

وەک سمۆرە
بە دار گوێزدا هەڵدەگەڕێم
بەڵام دار گوێز بەری نییە
دارستانی دار بەڕووەکان
بەدی دەکەم
گەڵا دەخۆم
تاوێرە بەردێ هەڵدەگرم
ڕێگای ئاسۆی پێ دەبەستم
با زێڕکفتی باڵی هەتاو
ورشەی نەیە
با شەونمی چاوی بەیان
لە سەر پەڕی گوڵ نەنیشێ
با تاریک بێ دەشت و دەوەن
با تاریک بێ بەند و بەندەن

## سێدارە

ئەمن بێوەی بمرم
مردووم
بێوەی بمکوژن
کوژراوم
بێوەی بمنێژن
نێژراوم
بێوەی خۆشم پێ بزانم
لە سێدارەی خەم
دراوم

## تراویلکە

تراویلکەم
سنگی سووتاوی چریکەم
پەڵە هەورێکی دووگیانم
کاتێ بەفرم
کاتێ پلووسکی بارانم

بۆکان

**خەم**

چەپکە گوڵێکی ژاکاوم
گڵکۆی عەشقێکی کوژراوم
مانگە شەوێکی بێ ڕەنگم
خەمی غەریبیم،
بێدەنگم

*تاران*

**گۆڕ**

خوێنی هەڵچووم
بەختی نوستووی لە مێژینەم
هەڵفڕینی بیرەوەریم
گۆڕی هەڵبەست و گۆرانیم

## چارەنووس

شینی رقم
دەشتی تینووی شۆڕەکاتم
ئەسپی سەرکێشی تووڕەییم
چارەنووسی پەلی زامم

## هیوا

دیسانەکە دەڕویێمەوە
وەک دار
وەک گوڵ
یان وەک دڕوو
دەڕۆم دەڕۆم
دەگەم بە لوتکەی ئارەزوو

## داخ

کانیاوەکان کوێر بوونەوە
برینەکان شین بوونەوە
بە شێنەیی
پڕمەی گریانم گوێ دەیە

**(...)**

گزنگی بەیان
پەیامی پێنیە، تاراوە
گوڵی شەونم لەسەر گەڵای دار جێخۆش ناکا
کوورەی بوختان، بێوچان
گێژەڵووکەی هاوار، دەدەمێنێ،
هەناسە سوارە
من، تەنیا و تینوو
"ماندوو مردوو ڕەنج بابردوو"
لە شۆرەکاتی بیرەوەریدا دەتلێمەوە و
دڵم لە کامووسکی ڕەشی خۆیدا
کلوو کلوو، وەک بەفری بەهار
دەتوێتەوە

## شاری هەتیوی دڵ

تا کەی بێدەنگ بم؟
تا کەی دەنگی بێدەنگیم
لە کۆڵانە قوڕاوییەکانی
شارە غەریبەکەمدا
بخنکێنم؟
تا کەی ئاوێنەی ڕووناکی لەش
بە دووکەڵی شەو لێڵ کەم و
هێلانەی چاوم
شۆڕاوگەی فرمێسک بێ
**
من هەموو شەوێ
پڕ بە دڵم هاوار دەکەم
بەڵام کەس گوێی لێ نییە
زریانی کوورەی دڵم
لە سەر دیواری ماڵان دەنیشێ
بەڵام کەس نایبینێ

**

کاتێ
بوخچەی ئاڵۆزکاوی خەیاڵ دەکەمەوە
برینەکانم شین دەبنەوە
دەست دەگێڕم بۆ پەنجەی خۆر
دەروازەی شەو دەکرێتەوە
بەرەو شاری وەنەوشە ڕێ دەکەوم
هەناسەی گەرمە شین بەرۆکم دەگرێ
شەپۆلی پەژارە لوولم دەدا و
لە دەروونددا دەڕووخێم
پێکەنینی گورگی برسی
خەونەکانم کاڵ دەکاتەوە

**

من بەم ساڵەوە
سەد و یەک ساڵە
لە تاریکی دام
سەدەیەک و ساڵێکە
لە تاریکیدا شیعر دەڵێم
لە تاریکیدا هەنگاو هەڵدێنم
لە تاریکیدا دەژیم
تەپۆڵکی تەنیایی و
هەوری مات
هەواری حەسانەوەمن
گۆڕی خەیاڵ و
خەیاڵی تۆراو

تونێلی وڕێنەمن
ئاوازی مەنگ و
تەزووی رەشەبا
هەناسەمن
هەتاوی تەماوی و
وشەی مردوو
شاری هەتیوی دڵمن
❊❊
شیعرێکی قەدەغەم دەوێ
لە شیعرێکی قەدەغە دەگەڕێم
شیعرێکی قەدەغەی
شەختە گرتوو
شیعرێکی پڕ لە پەژارەی
ئەستێرە
سەررێژ لە زەماوەندی
خوێن
لێواولێو لە گوڵاڵەی
بریندار
شیعرێکی قەدەغەم
دەوێ

## سکاڵا

هەتاوم لە نێو تەمدا خنکاوە
خەمی ئەم شارە، لە من هاڵاوە
چاوم هێلانەی فرمێسکی گەشە
بە هیچ شەڕابێ ناکەومە گەشە
پەپوولەی وشەم بێشەم سووتاوە
منارەی دەنگم لە دار دراوە
شاژنی شیعرم مات و بێدەنگە
هێشووی هەتاوم، کاڵ و بێڕەنگە
لەسەر پەڕی گوڵ دەنگم تاساوە
ئاوێنەی بیرم، ژەنگی هێناوە
دەنگی کوندەبوو، دەوری تەنیوم
گورگی ڕۆژگار، هەڵیدڕیوم
باڵی فڕینم لێ بەستراوە
پەنجەرەی هیوام، لێداخراوە
سنگم ڕووشاوە بە چڕنووکی شەو

بە قاڕەی قالاو، هەڵدەستم لە خەو
لە شار و لە دێ و لە کێو و مەزرا
هەروەک قورقوشم بۆم قورسە هەوا
وڵاتی جوانم داگیرکراوە
هەرچی خۆشیە، لێمسەندراوە
هەڵپەڕکێ بۆنی مەرگی گرتووە
بە جارێ ژیان کۆچی کردووە
هەرلایەک دەچی مەینەت بە بارە
خەندەی دێوەزمە و دووپشک و مارە
گەردەلوولی با، تەم وەدی دێنێ
لەسەر گۆنای گوڵ، زووخاو دەڕوێنێ
خەنجێرەی خەم و نزگەرەی مەرگ
لافاوی قین و گۆرانی گورگ
قوڵپی هەناسە و نیگای خەماوی
زمانی زام و ڕۆحی ژەنگاوی
دێن و ڕادەبرێن یەک بەدووی یەکدا
بۆ تەرمی ئەوین خۆش دەکەن جێگا
منداڵان باڵیان وەک مەل کراوە
کیژان بە فیرۆ بەشیان خوراوە

بزە یاساخە بۆ لاوانی ژیر
لەسەر چەپکی گوڵ، خەفەت دەچنن پیر
شادی و هەڵپەڕکێ، باوی نەماوە
شین و گریان و قوڕ پێوان باوە
لە هەر جێیەک بێ قاقا و پێکەنین
دەوری دەگیرێ بە لافاوی قین
هەر دەم بەستنە و وەعدەی سەر خەرمان
خۆ سەر خەرمانیش هەر مەرگە و نەمان
ئەی خودا تا کەی ئەم زوڵم و زۆرە؟
تا کەی تان‌وپۆم دابگرێ خۆرە؟
تا کەی چەپکی خوێن، دیاری دەستم بێ؟
تا کەی قورسایی خەم هەڵبەستم بێ؟
تاکەی چڕنووکی شەو بمڕووشێنێ؟
مستی دێوەزمەی کەڕ بمڕووخێنێ؟
تا کەی خنکان و گریان و هاوار
جۆگەلەی خوێن و شمشێری تەتار؟
تا کەی بێدەنگی و هاژەی ڕەشەبا؟
لێفەی ئەییوب و هەناسە و بریا؟
تا کەی ئاوازی داڵ و دەنگی کوند
شاری وێران و تەمی تەرمی گوند

تا کەی گریانی شەم بێ گۆوەندم
خەم چەپکەی گوڵ بێ بۆ زەماوەندم؟
تا کەی دەرکی دڵ داخەم لە شادی؟
بە گوێچکەم نەگا بانگی ئازادی؟
ئاخۆ بەس نییە سێدارە و زیندان؟
بەس نییە ئاگر لە ژیان بەردان؟
بەس نییە تاسەی لێو و دڕکی قین؟
بەس نییە گوللە و لە خەو ڕاپەڕین؟
بەس نییە هووژەی مار و خەندەی دێو؟
شیعری قەدەغە و مەرگی سەربزێو؟
بەس نییە دڕکی لێو و مۆڕەی چاو؟
نامەی گرمۆڵە و قەبری گوم کراو؟
بەس نییە شەتڵی تەنیایی و هاوار؟
کوورەی بوختان و لێڵایی ڕووبار؟
بەس نییەناڵەی دڵی هەڵقرچاو؟
گۆڕی خەیاڵ و بەرۆکی ژاکاو؟
بەس نییە شاری تەنگ و مەترسی؟
شاری وێران و منداڵی برسی؟
بەس نییە گۆمی خوێن و دڵگوشین؟
دەنگی مزگەوت و فاتیحە و یاسین؟

بەڵێ بەسییەتی، ئەمما کوا دەستێ؟
بە چنگ و نینۆک پردێ هەڵبەستێ؟
ڕووباری خەبات وە سەرخا لە کێو
زەردە و پێکەنین بخاتە سەر لێو!
بە قەڵەمی ڕۆژ جەرگی شەو شەق کا
کتێبی مەینەت وەرەق وەرەق کا
ئاڵای ئازادی دەربێنێ لە تەم
ڕەشبەڵەک بگرین بێترس و بێخەم

٥٦/٩/٢٩

## تابلۆیەک لە هەورامان

کاتێ دڵم زۆر تەنگ ئەبێ
جادە بە جادە، دێ بە دێ
ڕووبار بە ڕووبار، شار بە شار
جانتای خەیاڵ هەڵئەگرم و
دەڕۆم بۆ دوور
تا شاری عەشق و ئەستێرە
تا مەڵبەندی خۆر و گزنگ
تا کۆساران
تا سەر لوتکەی بەرزی شاهۆ
تا غارەکەی قوڕی قەڵا
تا کەپرەکەی خاڵۆ حوسەین
تا ئاورگەی قەڵای منا و
تا تاڤگەی بڵ
من عاشقی ئاهورامەزدا و
زەرتوشتی گەورە و تەموورەم

من عاشقی هۆرەی جافی و سیاچەمانە و
چەمەریم
من عاشقی مەولەوی کورد
پیری شالیار
کۆسەی هەجیج
چۆم و ڕووباری سیروانم
من عاشقی دار و بەردی هەورامانم
***
کاتێ دڵم زۆر تەنگ ئەبێ
بوخچەی خەیاڵ تێکدەنێم و
خۆم دەخەمە سەر شاباڵی
شەپۆلێکی کەنار خۆری بەدەسەڵات
تا بە هێشووی گۆنایەوە هەڵمواسێ و
بمبا بۆ دوور
بۆ بارەگای شیعر و بزە
بۆ سەرچاوەی وشەی ناسک
بۆ هەرێمی بڵێسە و نوور
بۆ لای بزەی نەپشکووتووی ئاهوورایی
بۆ بانیژەی خۆشەویستی و
کۆشکی ئەوین
بۆ دەفەی سنگی کۆی مەکاڵ
بۆ ئامێزی پۆڕێ ئاسکی سڵی
چاو سەوزی کاڵ
بۆ لای لاوی کڵاش لە پای پەستەک لە بەر

بۆ لای شەنگە ژنی قژ خەنەیی هەوری لەسەر
تا بە دڵی حەز و تاسە
شارەزام کەن:
لە تەمەنی کورتی شەو و
درێژی ڕۆژ
لە کەژاوەی سووری هەتاو
لە مەشخەڵی گڕ و ئاگر
لە هەناسەی ئاو و زەوی و شنەی شەماڵ
لە پێنووسی بیرەوەری و ڕێژنەی کەزیە
لە شادەشتی گوڵاڵەی گەش
لە گەزۆی ماچ
لە گوڵدانی سنگ و بەرۆک
من تامەزرۆی نانی ساجی و
دووکەڵی دار و تەنوورم
من تامەزرۆی دوو سێ دەنک هەناری سوور
خۆرشتێکی لەتکە بادام
بەرچینەیەک هەنجیری تەڕ
پڕ گیرفانێک توو شیرینم
***
گەرای دەیان شیعری تازە
لە دەروونما سەر هەڵدەدا و
دەمبزوێنێ
ئای... هەورامان
بە بارتەقای باوەڕێکی قورس و قایم

به قورسایی چلچەمان و ئاویەرەکان
به باریکی ڕێگاکانی کوردستانی داگیرکراو
خۆشم دەوێی
خۆشم دەوێی و حەز ئەکەم
هەموو ڕۆژێ بەری بەیان
له دەلاقەی نیگامەوە
کڕنۆشێکت له بەر بکەم
له سیروانی زێدە جوانت
توونیایەتی خۆم بشکێنم
له داوێنتدا بسەکنم
له پەنجەرەی نیگاتەوە
شۆڕ ببمەوە و
له دەستتدا بتوێمەوە

*بۆکان*

## تەنیا وشەیەک

بۆ قافڵە سالاری شیعر: ئەحمەد شاملوو

گوتبوت:
نەمدەویست ناوی چەنگیز بزانم
نەمدەویست ناوی تەیموور بزانم
ناوی نادر بزانم و موحەممەدی خواجە
ئەو تاوانبارانە
ئەو خوێنمژانە؛
ئەمنیش نامەوێ ناوی هیتلێر بزانم
نامەوێ ناوی ستالین بزانم
ناوی پینۆشە و سەددام
ئەو دێوەزمانە
ئەو کاروانکوژانە؛
لە قوڵایی دڵەوە
لەوان و لەوانەی لەوان دەچن
بێزارم

****

گوتبوت:
دەمهەویست ناوی کەسێ فێر بم.
بەڵام فێر نەبووم
منیش:
دەردەکەم لە دەردی تۆ دەچێ گەورەم!
منیش
دەیانساڵە
دەیانساڵی ڕەبەقە
لە وشەیەک دەگەڕێم
تەنیا
وشەیەک
بەڵام نایبینمەوە

*تاران*

# هەڵۆ

*بۆ هەناسەی شیعر و و هەوێنی چیرۆک*
*بۆ هەواڵی رووناکایی*
*بۆ مارف ئاغایی*

منالّەکان یەک لە دوای یەک
لێم دەپرسن:
بۆ دیار نیە کاکە مارف؟
بۆچی ئێستا ماڵمان نایە و
باسی کتێبمان بۆ ناکا؟
بۆ نامەمان بۆ نانووسێ و
شیعری جوانمان بۆ نانێرێ؟
تۆخودا بابە پێمان بڵێ
مارف کێیە و چیە و چ کارەیە

یادی گەشی گەشتر دەبێ و
بوغزێکی ڕەش لە گەروومدا جێ خۆش دەکا

شەپۆلی خەم لوولم دەدا و
شەختەی مەرگی ئەو شاهێنە باڵ زێڕینە
لە دەروونندا دەمڕووخێنێ
کوڵی گریانم هەڵدەستێ و
لە دوای یەک دوو هەناسەیەک دەڵێم: ڕۆڵە
مارف ئیتر نە ماڵتان دێ و
نە نامەتان بۆ دەنووسێ
نە شیعرتان بۆ دەنێرێ و
نە بەو کورتە چیرۆکانەی
هەستی جوانتان دەبزوێنێ!
باسی کتێبتان بۆ ناکا و
لەسەر لوتکەی هیواکانتان
ئیتر شەقەی باڵی نایە!
ڕاست ئەوەیە، من تا ئێستا
نەمتوانیوە پێتان بڵێم
کە دێوەزمەی گرژی نەمان
زۆر بێ ئامان
لە شەوێکی سارد و سڕ و بەستەڵەکدا
شاڵاوێکی بردە سەر و
بە خەنجەرێکی ڕق ئەستوور

وەها جەرگ و دڵی پێکا
کە شۆڕاوگەی خوێنی گەشی
قەراغ جادەی سوور هەڵگێڕا و
ئیزنی نەدا لە سەر لێوی "خاتوو شەونم"
گوڵی شەونم بەجێ بێڵێ!
ئیزنی نەدا بە شەماڵدا
بۆ "پەیام"ی پەیامێکی کورت بنێرێ
ئیزنی نەدا ماڵئاوایی لە "یار" بکا و
بە سرتەش "سروە" بدوێنێ
بێهەست و خوست دڵی گەرمی سارد کردەوە و
ئێستا ڕۆحی بەرزەفڕی ئەو شابازە
لە ئاسمانی بەرزی ئەوین سەیر دەکا
ئاخر مارف هێندە شاد و شۆخ و شەنگ بوو
دنیای ئێمە بۆ ئەو تەنگ بوو
مارف گوڵ بوو، بەندی دڵ بوو
لە باوەڕیا چڕوپڕ بوو
لە پەنجەرەی نیگایەوە کەژاوەی ڕۆژ دەبیندرا
لە شینایی گلێنەیدا
گزنگ هێلانەی کردبوو
لە تانوپۆی دەماریدا شیعر لەنجەی دەکرد

لەسەر نووکی پێنووسەکەی
خۆشەویستی پیاسەی دەکرد
کاکە مارف تابلۆیەک بوو پڕ لە وشە
پڕ لە شیعری تەڕ و تازە
پڕ لە واژەی ئاهوورایی
بزەی لێوی لە مانگە شەو ڕووناکتر بوو
کۆمای وشەی بێشکەی هەتاوی ڕادەژەند
چرپە و سرتەی لە مۆسیقا دڵگرتر بوو
شانەی دەستی کەزیەی شیعری دادەهێنا
هۆنەرێکی دلاوا بوو،
بۆ کچ و کوڕ مامۆستا بوو
لەسەر تەختی هونەر شا بوو
بڕواتان بێ کۆچی سووری ئەو هەڵۆیە
هێند بێوادە و کوتوپڕ بوو
بێشک "بێکەس" بۆی گریاوە
"پەشێو" ئاخی هەڵکێشاوە
"ژیلا" لە نێو قەبرەکەیدا
جەرگ و دڵی هەڵقرچاوە
"سوارە" گەرچی کۆچی خۆشی هەروا سوور و بێوادە بوو
لە نێو "خەوە بەردینە"دا گەرمە شینی بۆ گێڕاوە

تۆخودا ڕۆڵە تا ئەو ڕۆژەی
ڕووباری ژین بە تانوپۆی لەشتاندا دێ
تا ئەو ساتەی خوێنی خەستی جووڵانەوە
ئەو دەمارە ناسكانەتان پاراو دەكا
كاتێ ناوی مارفتان بیست
بە سەر، بە چاو، بە دەست، بە پێ
بۆ ڕۆحی ئەو نەونەمامە كڕنۆش بەرن
بە ڕێزەوە ناوی بێنن
بە چاوی دڵ شیعرەكانی بخوێننەوە و تازە مەڵێن
مارف كێیە و مارف چییە؟
بڵێن مارف كێ بوو مارف چ بوو؟

دەروونم پڕ لە تاسەیە

بۆكان

# عەتری سڵاو

*بۆ ژیلا حوسێنی*

بێ‌وەی دیتبێتم، بیناسم
بێ‌وەی تەنیا جارێ، چاوم
لە چاویدا، قەتیس مابێ
لە دوورەوە دەمناسیەوە
بێ‌وەی دانیشتبێتم لە لای
بێ‌وەی عەتری سڵاوێکیش
ڕژابێتە سەر شەقامی هاتوچۆمان
لە دوورەوە بەدیم دەکرد
بێ‌وەی بێڵم هەستم بکا
بۆنی لەپی دەستیم دەدزی
بێ‌وەی خشپەی پێییم بیستبێ
هەستم دەکرد
بێ‌وەی بە ڕووباری دەنگی
شیعرێکی بۆ خوێندبێتمەوە
دەنگی بە گوێم ئاشنا بوو

هەزار کڕنۆشم بۆ دەبرد

****

ژیلا، تەنیا شاعیر نەبوو!

وێژەرێکی بەهێز نەبوو!

دنیایەک بوو پڕ لە وشە

پڕ لە واژەی تەڕ و تازە

دەریایەک بوو پڕ لە گەوهەر

پڕ لە سۆزی سیحری پیرۆز

وەک ئەستێرە،

****

دەنگی ئەسرین

بە ڕووناکی شیعرەکانی ئەو شاژنە

لە چاومدا جووڵەیەتی

خەم تانوپۆی داگرتووم

وەک پەپوولە

بەشوێن چرای شیعرەکانیدا دەسووڕێم

چرپە و سرتەی دەخۆمەوە

جارێکیتر، کڕنۆشێکی لەبەر دەکەم

چوارچێوەیەک لە وێنەکەی

وێنەی بەهەست و ڕازاوەی

دەست دەدەمێ و

دەیبەم بۆ دوور
بۆ بارەگای شیعر و ئەوین
بۆ کوێستانی شەوبۆ و نەسرین
بۆلای "ئوخماتوڤە"[١]ی قژکاڵ
ئوخماتوڤەی ناسک خەیاڵ
دەڵێم سڵاو:
ئەی تەواری بەرزەفڕی ئاسمانی ژین
ڕاستە ئەتۆ خوای هەستی
میحرابی وتە و هەڵبەستی
ڕاستە سەرچاوەی ئەوینی
لوتکەی هۆنراوەی بەتینی
بەڵام لەمڕۆوە تەنیا نی
بە تەنیایی باڵی "با" نی
ئەم خاتوونەش وەک تۆ وایە
دەریای شیعر و مۆسیقایە
عەزرا نیە
زۆر گەورەتر لە عەزرایە

***

[١] ئوخماتوڤە، شاژنێکی شیعری ڕووسە لە ساڵی ١٨٨٩ لەدایک بووە، لە مۆسکۆ ژیاوە لە ساڵی ١٩٦٦ دا کۆچی دوایی کردووە.

ئاخ شاژنی شیعری جوان و
وشەی ناسک
تۆخوا بێژە کوانێ وا زوو
کاتی کۆچی دوایی تۆ بوو؟
کامە ڕاوچیی گرژی دڵڕەش
وا کوتوپڕ
سێرەی نەمانی لێگرتی؟
کام لێوی ڕەش پێتدا نووسا و
جوانیی ڕوومەتی هەڵمژتی؟
بە کام پەیام دڵت لەرزی و
بۆ ئەوپەڕی شار، ڕۆیشتی؟
ئاخر تازە چ پەنجەیەک
بە کام کلیل
درگای دڵت دەکاتەوە؟
لەکام خێمە و خەرگای تازە
خەمەکانت هەڵدەڕێژی ؟
لەگەڵ ڕۆحی گەورەی "فرووغ"[١]
بە کام زمان قسە دەکەی؟

---

[١] فروغ فەروخزاد، یەک لە بەهێزترین شاعیرانی فارس لە ساڵی ١٩١٤دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٩٤٥دا کۆچی دوایی کردووە.

لە پەنجەرەی تۆراوەوە

لەنجەی قومری چۆن دەبینی؟

بەرۆکی شەو چۆن دادەدڕی؟

شەوی تەمەن

چۆن شەق دەکەی؟

*بۆکان*

## کیژی بۆکانی

ئەی کیژی نەرم و نۆڵی بۆکانی!
ئەی خولْقێنەری شیعر و گۆرانی!
ئەی باڵا بەرزی توند و گورج و گۆڵ
ئەی ڕێکوپێکی تورت و سپی و سۆڵ
ئەی خاسەکەوی دەم بە پێکەنین
ئەی خان و مانی جوان و نازەنین
توخودا پێم بڵێ بۆ هێندە جوانی
بۆ وا ئاڕاستە و لە بەر دڵانی
چ دایکێ مەمکی لە زارت ناوە
کام مەلا بانگی بە گوێتدا داوە؟
چ مامۆستایەک ئاوا دایڕشتووی
چ شێخێک دوعای بە سەردا خوێندووی؟
چەندەت لێ جوانە کیژی کۆڵ نەدەر
پشتێنی هەوری و کلۆنجەی مەخمەر

له باغی سینگت جووتێ لیمۆ هەن
که ئیمان و دین به بادا دەدەن
تا دڵ دەخوازێ ژیر و بێوێنەی
پاکی، رووناکی، وێنەی ئاوێنەی
بەڵێ ئەی کیژی جوان و دڵڕفێن!
ئەی هەوری لاری ژیکەڵە و خاوێن
چاوی بەد به دوور، به دوور بی له خەم!
به دوور بی ئەی گوڵ له دەرد و وەرهەم
هەر گوڵ بی بەڵام عومرت گوڵ نەبێ
دڵی پڕ هەستت قەت له کوڵ نەبێ
هەر پیرۆزی بێ ژیان و ژینت
بەرز بێ لوتکەی بەختی ئەوینت
هەروا ئازاد و شاد و سەروەر بی
له نێو سەراندا هەر ئاوا سەر بی

## مەرگی جوانی

چڕنووکی شەو
گۆمیلکەی خوێن بەدی دێنێ
لافاوی رق
خاچی گومان دادەپۆشێ
ئەستێرەی ژەک
کاروانی خەم بەدی دەکا
پێکەنینی گورگی برسی
مەرگی جوانی وە پێش دەخا

## دڵەخورپە

کۆڵانەکان
تەنگەبەرن
چڕە دووکەڵ
دەرک و بانی داگرتووە
ئەسپی قەرەج
رووناکایی لێ گوم بووە
دڵە خورپە
کۆرپەی نەمامی کوشتووە
تراویلکەش لە چاو گومە

## پرچی ئاڵەکۆک

چاوم پڕە لە نوور
دەستم پڕە لە سێوی سوور
سەرڕێژە باوەشم
لە گەزیزە و چم[١] و چنور
چەند جوانە مانگەشەو
بۆمان بخوێنێ کەو
چەند خۆشە بۆنی یار
چەند خۆشە فەسڵی سوێسن و سووسەنبەر و بەهار
ئاخۆ ئەوینەکەم
دنیا و دینەکەم
کەی دێتەوە لە شار؟
***
با دڵ بدەم بە ئاو
با دڵ لە پرچی ئاڵەکۆک و شنەی با
گرێ بدەم
با خۆم بە سەر لقی داری چنارەوە
هەڵاوەسم

---

[١] خونچەی گەڵووک (هەمبانە بۆرینە)

با هەڵگرم لە کێوی وەفا
بوخچەیەک گزنگ
با لێوەکەم لە دەشتی هەڵاڵان، گوڵاڵەیەک
با هەڵکەنم بە پەنجەیەکی پڕ لە شەوقەوە
ڕێواس و کەنگر و لووشە و مەنێ و بەنا
بڕنم شەمامە لە بێستانی خۆرەتاو
بدزم لە دوور دوورەوە
بەرچینەیەک شەبەق
جانتایە پڕ بکەم لە تەڕە و کارگ و کەما
بێنم بە چنگ و چارەکە قەزوان و کووزەڵە

****

سنگم پڕە لە عەشق
لێوم پڕە لە ماچ
چەند خۆشە بۆنی ڕوومەت و
سنگ و بەرۆکی یار
ئاخۆ ئەوینەکەم
دنیا و دینەکەم
کەی دێتەوە لە کار؟

ورمێ، خەستەخانەی ئیمام رەزا

## دوورگە

ڕۆژی وایە
پێنووسی خەیاڵ بە "ئاو"دا دەدەم و
بە گۆچانی بیرەوەری
کۆڵان بە کۆڵان
بەسەرهاتەکانم دەنووسمەوە
جاری وایە
کامێرای چاو بە "با" دەسپێرم و
بە قامکی دڵ
هەنگاو بە هەنگاو
تەسبێحی خۆشەویستی دەهۆنمەوە
کاتی وایە
هەستم دەخەمە چوارچێوەی هەڵبەستم و
بە پێڵاوی شیعر
دووکان بە دووکان
لە مسقاڵێ "وەفا" دەگەڕێم
شەوی وایە
بە قرچە قرچی پەراسووی نووسراوەکانم

لە خەو ڕادەچڵەکێم و
بە دوای جێ پێی تاریکیدا
زۆربەی شەقامە تۆزاوییەکان گەز دەکەم
بەڵام گۆچانی بیرەوەری دەشکێ
تەسبێحی خۆشەویستی دەپسێ
کزەبای شەقامەکان هەناسەم سوار دەکا و
بە قیراتیش "وەفا" نابینمەوە
***
ئاهەنگی خەمباری شمشاڵێکی ژەنگاوی
لەگەڵ سۆزەی دڵتەزێنی تەموورەیەکی موبارەک
پەردەی گوێم دەلاوێنێتەوە
لە قاڵبی خۆم دێمە دەرێ
شاری ماران بەجێ دێڵم
سەری خۆم هەڵدەگرم
دەشتە کاکی بە کاکییەکان دەپێوم و
بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە
دەڕۆم
دەڕۆم بۆ دوور
بۆ شادەشتی خەون و خەیاڵ
بۆ میحرابی عەشق و ئەوین
بۆ لای مەیخانە چۆڵەکانی ئەندەلوس
بۆ لای پێکە خاڵییەکانی باخچەی پاشا
بۆ لای پەیکەرە سەهۆڵییەکانی
شاعیرە لێو دڕاوەکان

بۆ لای گۆڕی نووسەرە پێنووس شکاوەکانی دياربەکر
بۆ لای رووبارە وشک هەڵگەڕاوەکانی فەلەستين
بۆ لای کۆڵانە قوڕاوييەکانی هەلی منالێم
کە بە پێڵاوی يەمەنيش پەڕانەوەی لێ عەستەم بوو
بەڵام هەرچی دەکەم، هەر ناتوانم
دوورگەيەکی پڕ لە وشە بەدی بکەم
کە بۆ ڕۆژێک، تەنيا ڕۆژێک
جانتای خەمی ساڵەکانمی بۆ هەڵڕێژم و
لەشی ماندووی لە ئامێزدا وەحەسێنم

***

هەناسەی کازيوە
لە سەر سنگ و بەرۆکم پياسە دەکا
توێخوڵی ناسکی زمانم بە ددان دەپچڕم و
بە عيسای شيعرەکانم دەڵێم:
کۆڵکەزێڕينەيەکی کەمڕەنگ
لەگەڵ شينايی ئاسمان تێکەڵ کات و
لە ئەنگوستە چاوی ژياندا
وێنووسێکی ئاهوورايی بخولقێنێ.
بە چەخماخەی پێنووسەکەم دەڵێم:
خەڵفی تاسەی سوورم
لە قەراغ ڕووبارێکی مەندی خەمناک
بچەقێنێ و
بە سيحری سپی ملوانکەی بزەت بيڕازێنێتەوە
لە دەلاقەی پەنجێرە بێ شووشەکەمەوە

سەر دەردێنم
ئاونگی بۆنخۆشی خونچەی تەوێڵت
دەخۆمەوە
بە عارەقی گەڵای گۆنات
دەستنوێژێک دەشۆم
لەژێر سێبەری کەزیەتدا
نوێژەکەم دادەبەستم
دوا بە دوای سڵاوی نوێژەکەم
تنۆک تنۆک،
خوناوەی لاجانگت هەڵدەمژم و
فاتیحایەک
بۆ تەواوی عەشقە لەدەستچووەکانم
دەخوێنم

بۆکان

## تەلیسم

نیوەشەوێک
هەر خۆم بووم و دڵم
دڵی تەنگی پڕ لە کوڵم
تا چاو دەیدی تاریکی بوو
یا رووناکی مانای نەبوو
یا خۆی لە من حاشار دابوو!
هەر خۆم بووم و دڵم،
نە تەلیسمی سینگ و مەمی هەوری لارێک
بێوازیمی دەگرتە خۆی
نە هاوریشمی پڕ لە رەمزی ئەگریجەیەک
تەنیاییمی دەهۆندەوە
هەر خۆم بووم و دڵم
دڵی تەنگی پڕ لە کوڵم
تەرمی جوانی تاسە ناشتن
لافاوی ڕق، ئەسرین ڕشتن
مەرگی بزە و ئەستێرەی ژەک
دەستیان کردبوو بە هاتوچۆ
یەک لەدوای یەک

لەپڕ بیرێک، بیرێکی تیژ
بیرەکانی ترمی لادا:
ڕاستی! بڵێی ئەوین چی بێ؟
کەزیەی کاڵێک؟
کوڵمەی ئاڵێک؟
وردە خاڵێک؟
ئەوین یانی گریان و شین
ئەوین یانی دەرد و ئەسرین
بە خەم چەندن، شەونخوونی
دڵە تەپە و خەو لێڕەوین.
دەڵێن ئەوین
ئەوین یانی لوتکەی هیوا
خۆشەویستی و تاقگەی نیگا
ئەوین یانی برووسکەی قین
یانی ئاخ و داخ و گرین
ئەوین یانی سنگی سووتاو
خاو بوونەوە و هەناوێکی ڕەش هەڵگەڕاو
ئەوین یانی کڕنۆش بردن
لە ڕۆژێکدا سەد جار مردن
ئەوین یانی لەسەرخۆ چوون
قرچەی جەرگ و ئاوارە بوون
ئەوین یانی مامزی جوان
خۆ لە چۆڵ و بیابان دان
خاتووزین، مەم، شەم و شەمزین

خەج و سیامەند، فەرهاد و شیرین
هەموو دەچنەوە سەر ئەوین
بەڵێ مانای ئەوین قووڵە
ئاوێنەی خەم، گریانی شەم
گوڵ و گوڵزار، چۆم و ڕووبار
باغ و چیمەن
دەشت و دەوەن
هەموو مانای ئەوین دەدەن
جا ئەو کاتە کە هەستم کرد
مانای ئەوین کەم تا کورتێ شی بۆتەوە
خۆم کردە خەو
بوومە میوان، لە دێوی شەو

*بۆکان*

## دزی

چیایەکی بەرز بوایەی
لە دوورەوە دەهاتمە لات
خۆم دەکردە لاولاوێک و
هێور هێور
تا ئەوپەڕی لوتکەی حەزت
بە باڵاتدا هەڵدەگەڕام
***
ڕووبارێکی بەرین بوایەی
لە قەراغت دادەنیشتم
ماسیەکانی نێو بەرۆکتم
یەکە یەکە
بە قولاپی لێوم دەگرت
***
بێستانێکی نەخشین بوایەی
لە سووچێکی پەرژینەکەت
بێ هەست و خوست
درگایەکم دەکردەوە
دەنکێ شەمامەم لێ دەدزی و
هەموو ڕۆژێ دەیان کەڕەت
بە یادی تۆ بۆنم دەکرد
***

گوندێک بوایەی
پڕ لە ژوانی خۆشەویستی و
شەنگە ژنی قژ خەنەیی
ماڵێکم لێ دروست دەکرد
دیوار هەموو لە ئاوێنە
وێنەیەکتم هەڵدەواسی
بە پشتێنی پەشمینە و
کراسێکی مەخمەرەوە
هەموو شەوێ، تا ئەستێرە ئاوا دەبوو
لەگەڵ پەلکەی کەزیەکانت
ڕەشبەڵەکم لێ دەگێڕا
***
بەڵام ئێستا کە هیچیان نی و
شاکچێکی ئەفسانەیی و
خاتوونێکی ئێسک سووکی
ئیزنم بدە
شەوێک هەتا زەردەی شەبەق
خۆشەویستیت بخوێنمەوە و
بێوەی چاوم بچێتە خەو
لە ئامێزی پڕ لە وشەی تەنیاییتدا
بێشکەی ئەوینم ڕاژەنم

لەندەن، جولای ٢٠٠٠

## سپیدەنگ

له کام شوێنەوه بەرەو پیرت بێم؟
له کام دەلاقەوه سەیرت بکەم؟
له کام دەروازەوه بتدوێنم؟
که دڵۆپێک له ڕووباری سپیی دەنگت
بڕژێته سەر زامی کۆنی تەنیاییم و
کوڵی دڵم دامرکێنێ!
به کام شەڕاب مەستم دەکەی؟
هاڵاوی دەم

یان گوڵاوی سنگ و بەرۆک؟
بە کام شیعر هەستم دەکەی؟
نوێ یان غەزەل؟
بە کام زمان دەمدوێنی؟
ئیشارەی چاو
یا نە، چپەی ناو گوێ؟
کە هەر نەختێک
تەنیا نەختێک
ڕەنگی تۆخی سەرگەردانی و
بێ پەناییم
لە وڵاتی کۆیلەتیدا
کاڵ کاتەوە و
تامی تاڵی دەربەدەری
لە گەرووما بشواتەوە

***

ئای چەندە غەریبم
لە ناو ئەوانەی وا خۆشم دەوێن
چەندە نامۆم
بۆ ئەوانەی وا خۆشیان دەوێم
چەند غەوارەم
لە شەقامی فێ لێهاتووی
ئەم ژیانە پڕ ژانەدا

*لەندەن، جوەنی ٢٠٠٠*

## شەوبۆ

لە دووری تۆ، دڵم شێواوە شەوبۆ!
بە بێ ئاگر، لەشم برژاوە شەوبۆ!
لەوێ ڕۆژێوە دیمی بۆ هەوەڵ جار
نە ئیمانم نە دینم ماوە، شەوبۆ
لە کوێت بوو ئەو هەموو بسکە درێژە؟
قژە یا نە خەیاتەی خاوە، شەوبۆ؟
چ داوێکە کەوانی سەر مژۆڵت؟
چ جوان و دڵگرە ئەو داوە، شەوبۆ!
وەکوو ئاگر گەشن، سەر کوڵمەکانت
ئەمن ناڵێم، لە شاری قاوە شەوبۆ!
بزەی لێوت چ شیرینە عەزیزم
گوڵە یا خونچەیە؟ چی ناوە شەوبۆ؟
بەڵاگەردانی چاوی پڕ خەوت بم
چ سێحر و جادووە ئەو چاوە شەوبۆ!

دەوایە بۆ برینم ماچی خاڵت
چ خاڵێکە؟ سەرم سوورِ ماوە شەوبۆ!
چ بۆن خۆشن شەمامەی باغی سنگت
نەسیبم بێ! لە کوێت هێناوە شەوبۆ؟
"لە نەسلی ئادەمیی جوانی وەکوو تۆ
درۆیە گەر بلێن، خولقاوە شەوبۆ"!
بەسە، تەفرەم مەدە چی دیکە عەیبە
کە ئەسرینم دەڵێی لافاوە، شەوبۆ!
بە مەرگی تۆ کە وەک بوت دەتپەرەستم
لە دووریت خواردنم زووخاوە شەوبۆ!
ئەوینم تۆی و دینم تۆی و بێ تۆ
هەوا گیراوە، دڵ خوێناوە شەوبۆ!

## چاوی تۆ

ڕێبوارێکی ماندووم
هەناسەی تەنیایی
هەر چوار تەنیشتی تەنیوم
کەلاوەیەکم بۆ حەسانەوە نییە
شۆرەکاتی بیرەوەری
خەونەکانی کاڵ کردوومەوە
کەشتیی هیوام
لە بەندەری خۆشەویستی گوم بووە
شووشەی ئاواتم
لە مەیخانە چۆڵەکانی وڵاتدا
خنکاوە

کوندەبوو
لەسەر دیواری دڵم
هێلانەی کردووە
ئێسکەکانم دەبرووسکێنن
هیچ ئاسۆیەک بەدی ناکەم
هاوارم بە کەس ناگا
بڵێسەی ئارەزووم
چوارچێوەی هەناسەمە و
ئاخر مەنزڵم
چاوی تۆیە

*تاران*

## لیمۆ

لیمۆ! سوێند ئەخۆم بە عەشق و مەستی
لیمۆ بە ڕێگەی پاکی سەربەستی
لیمۆ سوێند ئەخۆم بە بورجی ئاوات
بە دەرد و مەینەت بە ڕەنجی خەبات
لیمۆ سوێند ئەخۆم بە شەوی شوانی
بە ڕووناکایی بەری بەیانی
لیمۆ بە ژاڵە و شەمدان و شەوبۆ
بەو خۆرەی کە وا دەردێ لە ئاسۆ
لیمۆ بە مەرگی پیاوانی نەمر
لیمۆ بە ئەسرین، لیمۆ بە ئاور
بەو هۆنەرانەی کە دروا لێویان
بەو عاشقانەی کە گوم بوو نێویان
بەو هەڵبەستانەی کە کووژانەوە
بەو برینانەی کە کولانەوە
بە ڕا و تەگبیری پیاوە ژیرەکان
بە ئاه و ناڵەی دایکە پیرەکان
بە کرماشان و شاهۆی سەربەرزی
بە بێستوون و تاقی خۆش تەرزی

بەو رەنجەی فەرهاد کێشای بۆ شیرین
بە خەم بە ئەرک بە دەردی ئەوین
بە شاخەکانی بەرزی هەورامان
بە کۆسەی هەجیج سەرچاوەی ئیمان
بە هاوڕەنگانی شاری مەریوان
بە سیحری ئاسۆی زرێباری جوان
بە هاودەنگانی بەشی کوردستان
بە سنە، لوتکەی هونەر و عیرفان
بە سەققز بێشکەی کتێب و وتار
بە دیواندەرە و تیکاب و بیجار
"بە سوبحی سەردەشت بە شامی بانە
بە خەوی خۆشی دەشتی رەزیانە"
بە پیرانشار و نەغەدە و شنۆ
بە زێ و بە ورمێی لە مێژینەی خۆ
بە مەهاباد و چوار چرای گەشی
بە گڕ و تینی خەڵکی سەرکەشی
بە بۆکان دەریای شیعر و مۆسیقا
بە ناڵەشکێنە و سەر حەوز و قەڵا
لیمۆ! هەر تۆم هەی هەر تۆی ئەوینم
تۆی هاژەی عەشق و هێلانەی ژینم
هەر تۆی هەناسە و جۆلانەی هەستم
ئاخر تۆ بتی و من بتپەرەستم

## بەهار

دیسان بەهارە، بەهارێکی جوان
سەوز و سوور نەخشان لە لووتکەی کێوان
کیژان هاتنە دەر، تورت و کرژ و خاو
لاوان ڕاوەستان، لەسەر کانی و ئاو
شوانان دەرکەوتن، بە شمشاڵەوە
بە زکر و فیکری چاوی کاڵەوە
سەرچاوان تۆقین، لە شاخ و لە دەشت
گەزیزە پشکووت، شەش و حەوت و هەشت
باغان هاتنە بەر، شەماڵ کەوتە خۆ
پەرەی گرت، بۆنی شەمدان و شەوبۆ
داران گوڵیان کرد، نێرگز کەوتە دەر
ڕەنگان وەنەوشە و نەسرین و شەشپەڕ

گوڵاڵە سوورە کەوتە پێکەنین
هەڵاڵە و هێرۆ لە خەو ڕاپەڕین
ئاڵەکۆک شین بوو، وەنەوشە هەستا
گوڵ چەپکە چەپکە، بۆ دیاری برا
تا چاو کار دەکا کەسکە و زەردە و شین
قاقا کێشانە و بەزمە و هەڵپەڕین
لە لایەک شەمزین بۆ شەم ناز دەکا
لە لایەک شایەر، چۆپی ساز دەکا
لایەک شەونمە و لایەک لاولاوە
لە لایەک ڕاوچی، خەریکی ڕاوە
بەڵام گوڵی من، بەهار بە من چی؟
گوڵ و گوڵاڵە و ڕووبار بە من چی؟
بە من چی "خەجێ" دەچێ بۆ سەیران؟
"شەمێ" شیو دەکا، ویرەی دێ "جەیران"؟
بە من چی "رابی" مەشکە دەژێنێ؟
"بەگم" نان دەکا "بەسێ" دۆ دێنێ؟
بە من چی "ئەستێ" و "زلێخا" و "نازدار"
خۆیان ساز دەکەن دەچن بۆ هەوار؟
بە من چی "خونچە" و "خەزاڵ" و "ئەسمەر"؟
بێری دەدۆشن بە دەستی دولبەر

بە من چی "فەرەج" "گەوەر" دەدوێنێ؟
"خدر" دەتۆرێ "فەحە" ژن دێنێ؟
بە من چی "هەیاس" دەچێ بۆ قۆپی؟
"شەنگە" و "وسوە شێت" دەگرن سەرچۆپی؟
ئەمن تۆم دەوێ، تۆی دڵداری من!
تۆی ئاڵەکۆک و تۆی بەهاری من
تۆی گرمە و قاقا و پێکەنینی من
تۆی زەردەخەنە و شادی و شینی من
تۆی هاژەی چەم و شنەی شەماڵم
تۆی دەشت و دەر و سۆزەی شمشاڵم
تۆی سووسەنبەر و شەوبۆ و نەسرینم
تۆی لووتکەی هیوا و تاڤگەی ئەوینم
بە تۆوە دەژیم بە تۆوە ماوم
لە خۆشی تۆیە دەبینێ چاوم

## باوەش

کاتێ لە چاومدا هەڵدێی
تابڵۆیەکی.
تابڵۆیەکی پڕ لە وشە
پڕ لە وێنەی ئاهووراییی و گۆنای شیعر
کاتێ بۆنی دەستت دەمژم
باوەشێکی
باوەشێکی پڕ لە هەتاو
پڕ لە بۆنی نانی تازە و
عەتری گوڵاو
بە چاوی دڵ خۆشم دەوێی
بە چاوی دڵ بە دواتەوەم
ئاخر چاوی دڵی کەیلم
قەت قەت باڵای تۆ گوم ناکا

*تاران*

## ژوان

لە جێژوان ڕاوەستاوم
چاوم چوار تەنیشتم دەکێڵێ
کارمامزی سڵی باڵای
بێوەی چاوی لە چاوم گرێ دا
بە بەر دەممدا دێ و
زۆر بە توندی تێدەپەڕێ
عەتری کەزیەی پڕ لە هەستی
دەور و بەرم پاراو دەکا
دەزانێ چاوەڕوانی دەکەم
بەڵام خۆی گێل دەکا و دەڕوا و
منی تامەزرۆ، لە دنیای بێ سنووری خەیاڵەکانمدا
بە جێ دێڵێ و
ئاوڕێکیشم لێ ناداتەوە
لام وایە هەر حەز دەکا
لە گێژاوی چاوەڕوانیدا بیلێمەوە و

بەم شێوەیە ئازارم دا
بەڵام ئەو ئازارە هەر چەندە زۆر قورس و گرانە
وەها لە رایەڵ و پۆمدا کاری کردووە
هەر حەز دەکەم
بچمەوە ئەو جێ ژوانە و
چاوەڕوانی بکەم

*لەندەن*

## شیرین بەهار[١]

خۆزگە ئەمنیش لەم وڵاتە جوانە، یارێکم دەبوو
شۆخ و شەنگێ، نەرم و نۆڵێ، نازدارێکم دەبوو
خۆزگە عەشقی نازەنینێ شاری دڵمی پڕ دەکرد
لەم دەمودەزگایە ئەمنیش چاو خومارێکم دەبوو
خۆزگە وەک ئەو لاوە پڕ هەستانە ئەمنیش سەردەمێ
شەو هەتا سۆزەی بەیانی ئینتیزارێکم دەبوو
ئاگری بێمەیلی ئەو جەرگی منی لەتلەت دەکرد
خۆزگە لەو ئامێزە گەرمەی یادگارێکم دەبوو
دین و ژین و هێز و ئیمانی دەبرد ئەو دڵڕەقە
خۆزگە وەک خوسرەو منیش شیرین بەهارێکم دەبوو

---

[١] وەرگێڕاوی شیعرێکی شاعیر کە لە ساڵی ١٣٤١دا لە کتێبی فارسی "سرود پرستو"دا چاپ کراوە

خۆزگە فرمێسکی وشەم ئەمجارە کارێکی دەکرد
لەو خەلە و خەرمانە وەعدەی جاروبارێکم دەبوو
نیوەشەو چاوێکی نامۆ، چاوەدێرێکی دەکرد
جاروبارە گەر بە بێدەنگی، قەرارێکم دەبوو
دەرک و بانم لێدەگرت و خۆم دەخستە باوەشی
باوەشێکی نەرم و سایەی تاقە دارێکم دەبوو

## باوەشێن

گوتم دەردی ئەوینت، دڵتەزێنە
گوتی ئەو دەردە بۆ شیعرت، هەوێنە
گوتم ڕێژنەی قژت، سایەی سەرم بێ
گوتی ئەو سێبەرە، عیللەت پەڕێنە
گوتم چاوی لە بەر هەڵنایە هەنیەت
گوتی جەزبەی هەیە، چاو هەڵمەهێنە
گوتم تیری موژەت، عاشق دەپێکێ
گوتی ئەو تیرە، هەر عاشق بە خوێنە
گوتم ئەو چاوە بازانەت منی کوشت
گوتی نێچیرە عەشقی ئەو شەهێنە
گوتم وەک چی دەچێ ئەو کوڵمە سوورەت
گوتی قیبلەی دڵە، سەر دانەوێنە
گوتم عەتری هەناسەت، مەستی کردم
گوتی ئەو عەترە، بادەی خەمڕەوێنە
گوتم لێوت، وەکوو غونچەی گوڵانە
گوتی غونچە لە کوێ وا دڵڕفێنە؟

گوتم وەک بەندی هەوری لارە دەنگت
گوتی ئەو دەنگە، بەندی دڵپسێنە
گوتم تا دەست هەڵێنی، بەرزە باڵات
گوتی ناگاتێ دەستت، سەر هەڵێنە
گوتم کۆن بوو لە دڵما ڕەنجی دووریت
گوتی شیعرێکی تازەم، بۆ وەخوێنە
گوتم گۆوەندە، بریا تۆم دەگەڵ بای
گوتی یادێکی من، تاسە شکێنە
گوتم دامناوە ئەمشەو بێمە ژوانێ
گوتی نابیسی هەرگیز ئەم بەڵێنە
گوتم خۆزگە لە ئامێزم دەگرتی
گوتی خەونێکی خۆشە، مەیڕەوێنە
گوتم خۆ کەعبە کەج نابێ بە ماچێ
گوتی زیاتر لەوە، پێ هەڵمەهێنە
گوتم ئاهی "وەفا" دەتپێکێ ئاخر
گوتی چەند خۆشە بای ئەو باوەشێنە

## سیلەی چاو

هەموو شەوێ لە ئاسمانی خەیاڵمدا
ئاسۆی سیحری دوو چاوی گەش
کێڵگەی لەشم ڕووناک دەکا و
پەڵەی خەمم لە دەروونندا دەشواتەوە.
هەموو شەوێ شەتڵی ساوای گوڵوشەیەک
لە نێو تانوپۆمدا دەڕوێ و
دڵۆپ دڵۆپ بە فرمێسکم پاراو دەبێ.
هەموو شەوێ لە ئاوێنەی خەیاڵمدا
وێنەیەکی ڕێکوپێکی ئاهوورایی
بە سیلەی چاو دەمدوێنێ و
دەوروبەرم لە بۆنی خۆی سەرڕێژ دەکا.
هەموو شەوێ
پەلکەی قژی شاژنێکی چاو سەوزی کاڵ
شان و باهۆم دادەپۆشێ و
لە هێلانەی گلێنەمدا جێ خۆش دەکا
لە ڕووباری ئامێزیدا مەلە دەکەم

به سەرپەنجەی سپی و سۆڵی
بادەی کۆنم بۆ تێ دەکا
به سەمفۆنیای شۆڕەبییەکان
زەماوەندم بۆ پێک دێنێ
به دەنگێکی نەرم و ناسک
شیعری شەبەقم بۆ دەڵێ
به خەندەی لێو
عەقڵ و هۆشم لێ دەستێنێ
هەموو شەوێ ترپەی پێی دێ
عەتری کەزیەی رێکوپێکی
دەمارەکانم پڕ دەکا
"به مۆسیقا و شیعر و وتە"
گزنگم پێ نیشان دەدا
هەموو شەوێ لە عالەمی خەیاڵمدا
دەروازەی دڵ دەکەمەوە و
فەڕشی هەناسەم رادەخەم
نە یەک، نە دوو،
دەیان کڕنۆشی بۆ دەبەم
"لە شوێن چرای شیعرەکانی"
"وەک پەپوولە دەسووتێم و" هەڵدەپڕووزێم
تا ئەو کاتەی خونچەی بەیان دەپشکوێ و
هەتاو لە سەر لوتکەی کێوان
بزەی دێتێ
منی تینوو، چاو دەبڕمە ئەو شوێنانەی

پێیدا دێت و پێیدا دەڕوا
بەڵکەم جارێک
تەنیا جارێک
تاڤگەی نیگای رێی لێ گوم بێ و
وەک ئاسکێکی سڵی ساوا، ئاوڕێکم لێ بداتەوە
بەڵام ئەو شۆخە دڵڕەقە، هەر حەز دەکا
لە ئاورگەی هۆنراوەیدا بتوێمەوە و
ئەویش شاد و مەست و سەرخۆش
لە دوورەوە سەیرم بکا

*بۆکان*

## جێژوان

گڵۆپەکان، یەک لە دوای یەک
لایە لایە ویرە دەکەن
قەڵای مەردان لە ترسی رۆژ
چۆپی و جەڵمان بە جێ دێڵێ و
لە قوژبن و پەنا و پەسیو خۆی مات دەدا
تەلیسمی سنگ
بەڵام زۆر زوو ئەستێرەکان
دەم لە سەر پشت
وەکوو سووتووی جغارەیەک
هەڵدەوەرێن
گزنگ لە سەر لوتکەی چیا
وردە وردە جێ خۆش دەکا
دوو هەناسە هێور هێور
لە یەکتری جیا دەبنەوە

*بۆکان*

## قژی شیعر

هیچ کاتێکم پێشک نایە
بەژن و باڵای ڕێکوپێکت
چاوی دڵمی، قەتیسی خۆی نەکردبێ
هیچ ڕۆژێکم وە بیر نایە
تاڵی دەنگت
لە تانوپۆم نەئاڵابێ و
گەڵای گۆنات
لقوپۆپی داری حەزمی دانەگرتبێ
هێچ شەوێکم وە بیر نایە
خەونم پێوە نەدیبێتی و
تاڤگەی نیگام، بەشوێنتدا
عەتری سڵاوێکی نەڕشتبێ

ئازیزەکەم
باوەڕت بێ
شنەی بسکت
چەپی و چۆپیم بۆ ساز دەکا
ژوانی هەنیەت دەمبزوێنێ
چاوت لە چاوم گرێ دەی
گرێی دڵم دەکرێتەوە
پێکەنینت سەوزم دەکا
بە یەک بزەت
هەتاوم لێ میوان دەبێ
لەرەی سنگت، بێشکەی عەشقم رادەژێنێ
شانەی دەستت
قژی شیعرم بۆ دادێنێ
رۆژباشێکت
پەڵەی زامم ساڕێژ دەکا
بەڵام گوڵم
ئەگەر رۆژێ لێم بتۆرێی
کەسەر دەبم
نەمدوێنی
شیعرم دەمرێ و

له شارەكەت تەریک دەبم

بەجێم بێڵی

خەمی دنیام لێ بار دەبێ و

هەرێمی چۆڵ، شێتم دەكا

ئاخر گوڵم

بەندی دڵم

تۆ بۆ منی سەر لێشێواو

تۆ بۆ منی پەڕ پڕووزاو

هەم ئاهووڕای، هەم ئەوێستای

هەم عیسای و هەم جۆلجۆتای

بە پرچی خۆت بمهۆنەوە!

*تاران*

## شاگەشکە

دەستت
بۆنی رەشە ریحانەی لێ دێ و
سنگت بۆنی مێخەک
دەنگت پڕ لە رازە و
سرتەت سەرڕێژ لە ئاواز
ناوت لە نێو گڕی شیعرەکانمدا ورشەی دێ و
یادت، شاری ئەوینم دەڕازێنێتەوە
***
لە درزی درگاوە بۆنت دێ
لە نێو ئیسکانەکانمدا دەنگت دێ
زەردەخەنەی یادەکانت
لە کووچە و کۆڵانەکانی شاری دڵم پیاسە دەکا
ئەی تۆ...
ئەوپەڕی بیر و باوەڕ و هەستم
کاتێ لە خەو هەڵدەستم

ئاونگی بۆنخۆشی هەناسەی گەرمت
لە سەر گەڵا گەڵای داری تەمەنم دەنیشێ و
بەربەڕۆچکەی بەهاری باڵات،
شەقامی شیعرم زێڕوەشان دەکا
کاتێ بە سیحری چاوەکانت دەمدوێنی
شاگەشکە دەبم و لە حاستە خۆ
وەک بەفری بەهار دەتوێمەوە
*بۆکان*

## ئۆقرە

لەو ڕۆژەوە کە تۆرای لێم
هیچ ئاهەنگێک سەرنجمی ڕانەکێشا
هیچ ئاگرێک دیوەکەمی گەرم نەکرد
چرپەی عەشقی هیچ نازدارێک
لەلای سنگی سەرینەکەم
هەڵنەترووشکا
هیچ خشپەیەک نەیلەرزاندم
دڵی کەیلم
لە هیچ شوێنێک نەحەساوە
لە هیچ جێیەک ئۆقرەم نەگرت
شایی نەچووم
هەڵنەپەڕیم
چۆپیم نەگرت
بزەش جارێک
لەسەر لێوم نەجووڵاوە و
لایەکی لێ نەکردمەوە

*بۆکان*

## لەپی دەست

شەوی وایە
لە عالەمی خەیاڵمدا
نە یەک، نە دوو، دەیان کەڕەت
خونچەی گەشی یادی سەوزت
لە یادمدا دەپشکوێ و
لق و پۆپی داری بزەم، گوڵ دەردەکا
ڕۆژی وایە
نە دە، نە سەد، هەزاران جار
بە چاوی دڵ
درگای سووری ئەوینی تۆ دەکەمەوە و
بە پەنجەی حەز،
بۆنی خونچەی لێوت دەدزم
کاتی واشە
لەپی دەستم هەڵدەکەنم و
هێور هێور

چپە و سرتەی تۆی تێدەکەم
هەندێ جاریش
تووڕەت دەکەم
لە خۆمەوە لە لام وایە
کاتێ نەختێ تووڕە دەبی
پشکۆی گۆنات گەشتر دەبێ و
لە جارانیش جوانتر دەبی
ئاخر شاری شیعر و شادیم!
عەشق و مەستی باوەڕێکن
ڕوومەت و لێو، باوەشێکن

با دەستنوێژی وەفا بشوێن!

*تاران*

## خۆشەویستی

بسک ڕەشی وڵاتەکەم!
گڕم، تینم، ئاسۆی ژینم!
لەمێژ ساڵە، کێڵگەی دیدەم
لە ئاسمانی ئەویندتدا
چاوەڕوانی بارانێکی ڕێژنەی قژتە و
هەرچی دەکا
ئەو بارانە هەر نابارێ
لەمێژساڵە، دڵی کەیلم
بۆ بزەیەک لە لێوی تۆ
وەک پەپوولە
بە شوێن چرای تەوێڵتدا
شەو شەق دەکا و
هەرچی دەکا
ئەو ئاواتە نایەتە دی
لەمێژ ساڵە
جەستەی خەستەم
بە پێڵاوی حەزی تاسە

بە دووی ئاوێنەی سنگتدا
وڵات بە وڵات گەز دەکا و
هەرچی دەکا
هەر پێت ناگا

***

بسک ڕەشی وڵاتەکەم!
ئاسکی سڵی سەحەت سووکی یادەکانم!
خۆزگە ڕۆژێ، تەنیا ڕۆژێ
شەتڵی دەستی جوانپەرەستم
لە باخچۆڵەی ئامێزتدا شین ببوایە و
بە هەناسەت پاراو بوایە
خۆزگە شەوێک، تەنیا شەوێک
لەشی ماندووی منی تینوو
لە ڕووباری ئەوینتدا مەلەیەکی بکردایە و
لەژێر تاڤگەی ئەگریجەتدا وەحەسایە
خۆشم دەوێی!
خۆشم دەوێی وەک نان
وەک ئاو، وەک هەناسە
خۆشم دەوێی وەک موسا، توور
وەک وێنەگر، وێنەکانی و
وەک شاعیرێک، شیعرەکانی

## مامزی هەزار ئاواز

لە ڕۆژ دەچی!
بە شەو لە ماڵی کەس نامێنییەوە
لە هەتاوی بەهار دەچی!
تاوێک بە سەد ناز و نیو ناز
لە ژێر هەور سەر دەردێنی و
تاوێکیشیان تورە دەبی و
خۆت دەشاریەوە.
لە ژین دەچی!
تاوێک تاڵی و ڕۆژێک شیرین
کاتی وایە، بە ئاهەنگی بزەی لێوت
بێشکەی دڵم ڕادەژەنی و
گەشە و نەشەم بۆ ساز دەکەی
کاتی واشە
بە ئیشارەی دەست و پەنجە
دەمتارێنی و تەریک دەبی
لە قژ دەچی!
جارێک ئاڵۆزکاوی و شێواو
جارێک چینچین و شانەکراو

شەوی وایە
بە نیم نیگای بازی چاوت
بەرەو جێژوان هانم دەدەی
شەوی واشە
بە سێدارەی نەفرەت و زام
دەمخنکێنی
بەڵام گوڵم!
ئەی مامزی هەزار ئاواز!
ئەمن بە دڵ خۆشم دەوێی
بە تەنیا دڵ؟
نا نا، بە تان‌وپۆ و ڕەگ و ڕیشە
ئەگەر تەنیا ساڵی جارێک
بە چاوی حەز، لایەکم لێ بکەیتەوە
هەموو ڕۆژێ هەتاوم لێ میوان دەبێ و
خەڵفی باغی شەونخوونیم
گوڵ دەردەکا
ئەگەر بێت و هەموو کاتێ
نێوچاوانم لێ تاڵ کەی و
لە دەروونِدا بمرۆخێنی
تەزووی ساردی بێمەیلی تۆ

وەک هەناسە هەڵدەمژم و

توونیەتیمی پێ دەشکێنم

ئاخر کەسم!

لە جوانیدا مەلە کردن

لە سێبەری قژدا خەوتن

لە ئامێزی سنگ و مەمدا توانەوە

ئاواتێکە

ئاواتێکە و بۆ هەموو کەس

نایەتە دی!

## هێشووی هەتاو

ئیتر بێتۆ سەیران ناچم!
سەیران بێتۆ، دەشتی خەمە
پەڵەی خەفەت، تاسە ناشتن
میژووی تەمە
سەیران بێتۆ گۆڕستانە
زەماوەندی خوێنە، ژانە
لاشەی بووکێکی نێژراوە
گڵکۆی عەشقێکی کوژراوە
***
ئەی هەواڵی ڕووناکایی و سەیری چەمان!
ئەی تۆ نازی مانگی چاردە و پەنجەی بەیان!
تۆ ئاسمانی پڕ لە وشەی بەهارێکی و
من هەناسەی پایزێکی پڕ لە تەزوو
تۆ ئامێزی باڵایەکی ئاهوورایی و
من داڵانی حەسرەتێکی بێ کۆتایی
تۆ هەوێنی گەشە و نەشە و پێکەنینی و

من دڵۆپی فرمێسکێکی نەنووسراوە،
تۆ شارۆگی شیعری جوانی
نێرگزی قژ، واژەی ناسک
بۆنی ژوانی
هێشووی هەتاو، لەنجەی قومری
تاڤگەی نیگای
تۆ گزنگی بەیانانی عەشق و وەفای
کوڵمەت ئاڵە، کەزیەت کاڵە
ئەستۆت شاری وردەخاڵە
لەگەڵ تۆ، ژەهراو شیرینە
قاوەی تاڵیش وەک هەنگوینە
من بەبێ تۆ وشەی مردووم
کێڵگەی برین، هەوری دەم کەل
میوەیەکی شەختە گرتووم
سەمای تەرمم
گۆمی خوێنم
لەسەر رووپەڕی گوڵاڵان
خەم دەچێنم

*تاران*

## نەفرەت

بۆ رۆیشتی؟ بۆ هاتیەوە؟
ئەگەر پێت وا بوو
بۆت دەبم بە عەشقێكی ئاهوورایی و
لەم شارەدا دەتكەم بە شابەیتی شیعرەكانم!
بۆ رۆیشتی؟
ئەگەر لە لات وا بوو دەتكەم بە شاژنێكی رازاوە
كە عالەمێک بەخیلیت پێ بەرێ
بۆ رۆیشتی
ئەگەر پێت وا بوو رۆژێكیان
لە دەفتەری ئەندێشەمدا
دەتكەم بە شاچرای سووژەكانی كەس نەبیستووم
بۆ رۆیشتی؟
یا نە ئەگەر لە لات وا بوو
لە باخەڵی گەرمی مندا
تامی خۆشی و خۆشەویستی قەت ناچێژی و
حەسانەوەت بۆ عەستەمە، بۆ هاتیەوە؟
ئەگەر لە لات وا بوو هەستی خەستی دڵدارییەكەت

له ئامێزی حەزی مندا بێ ئاکامە،
بۆ هاتیەوە؟
ئەگەر لە لات وا بوو هەرگیز
نابی بە نۆبووکی شیعرەکانم و
تۆفانی خەم ئاسوودەییت لێ دەستێنێ،
بۆ هاتیەوە؟
خۆ تۆ هەرچی دەتکوت،
ئەمن بە روویەکی ئاواڵەوە بەدیم دێنا
هەرچی تۆ خۆشت لێی دەهات
لە لای منیش خۆشەویست بوو
لە لای تۆ هەرچی جوان بوایە
با ناحەزیش، هەر پێم جوان بوو
قینت لە هەر شتێک بوایە
لە بەر ئەوەی تۆ پێت خۆش بێ
قینم لێی بوو
کەچی بەم حاڵەش رۆیشتی
رۆیشتی و بە جێت هێشتم
کۆچت کرد و ئاوڕێکیشت لێ نەدامەوە
خۆشی دنیات لە دڵما کوشت
گەرای ژینت تێدا کوشتم
تۆوی نەفرەتت تێدا چەندم
بە دەستی زۆر منت گۆڕی،
کارێکت کرد
لە چاومدا وەها رەش بووی

تازە هەرچی بیڵێی باوەڕ ناکەم
کۆتری دڵم لە سەر سەربانیماڵەکەت
وا هەڵفڕی
تازە هەرگیز نایەتەوە
ئیتر ئەو ڕۆژە نابینی وەکوو منداڵ بتلاوێنم
ئیتر ئەو ڕۆژە نابینی دەم بنێمە نێو سینگت و
بە لێوی حەز بێنی مەمکانت هەڵمژم
بۆ ڕۆیشتی؟ بۆ هاتیەوە؟

## کاڵێی قژ زەرد

لە هەر شوێنێک تۆی لێ نەبی
چاوم هیچ کەس بەدی ناکا
هەر سفرەیەک تۆ رووبەڕووم دانەنیشی
ئیشتیام بۆ هیچ شتێک ناچێ
هەر سەفەرێک چاوی رەشت
لە چاومدا قەتیس نەبێ
بەهەشتیشم پێ خۆش نییە
هەر سەیرانگەیێ، ئاوێنەی رووت
دەوروبەرم رووناک نەکا
هیچ ئاهەنگێک نامبزوێنێ
ئای کاڵێ گیان، کاڵێی قژ زەردا!
کاتێ ناوت لەسەر لێوی تاسەبارم
دەپشکوێ
خۆشەویستی دەوروبەرم دادەگرێت و
گرێی دڵم دەکرێتەوە
کاتێ نیگای ئاگرینت لە چاومدا جێ خۆش دەکا
هێز و توانام زیاتر دەبێ و

بزە لە سەر هەر دوو لێوم سەما دەکا
کاتێ خوناوەی گەردنت قەترە قەترە
دەڕژێتە نێو گەرووی حەزم
دار و بەرد و کەژ و کێوم
لێ دەبێتە بەهەشتی رووت
مەگەر کاڵێ...
قەرار نەبوو هەتا ماوین یاری یەک بین؟
لە شادی و خەم، لە دڵخۆشی و دەرد و وەرهەم
یار و دڵداری یەکتر بین؟
قەرار نەبوو قۆڵ لە قۆڵی یەکتر کەین و
تاریکایی شی کەینەوە؟
قەرار نەبوو دار نارنجێک لە حەوشەتان بچەقێنی و
کاتێ شین بوو
گەڵا گەڵا ناوی منی لێ هەڵکەنی؟
مەگەر قەرارمان وا نەبوو
شانەی سەری یەکتر بین و
بۆ یەک بژین،
بۆ یەک بمرین؟
ئەی چی لێ هات قەرارەکان؟
شەرت و عەهد و پەیمانەکان؟
ئەی چی لێ هات
ئەو سوێندانەی رۆژی سەد جار بۆت دەخواردم؟
ئای کاڵێ... کاڵێی کەم شەرت
بۆ بە ناحەق بە جێت هێشتم؟

دوای ئەو کۆچە سوورەی کردت
زامەکانم چۆن دەرمان کەم
خەمی گەورەی ئەو زامانەی
رۆژێ سەد جار دەکولێنەوە
لە کام وڵات دابینیان کەم؟
لە کامە شار بیاننێژم؟
لە چ هەردێک وەیانشارم؟
لە کوێ کاڵێ؟
لە کوێ کاڵێ؟

## عەتری سڵاو

چاوەکانت
ئاسۆیەکی دوورە دەستن
گڕن، تینن، پڕ مەبەستن
بەیانان زوو
کەژاوەی رۆژ هەڵدەبەستن
***
چاوەکانت دەرگایەکن
بۆ دیتنی شاری ئەوین
دەریایەکن بۆ دیتن
سەدان هەناسە هەڵدەمژن
ئەمن سەیری ئەو چاوانەت
ناگۆڕمەوە بە قەسرێکی باغی بەهەشت
ئەمن تەنیا نیگایەکت
ناگۆڕمەوە بە رووباری ئاوی کەوسەر
ئەتۆ بۆ من زنەی ژینی
لەنجەی قومری و شنەی شەماڵ

باڵەخانەی پێکەنینی
چاوەڕوانم رۆژێ چاوم
لە چاوتدا گرێ بخوا و
عەتری سڵاوێکم
بڕژێتە بەر دەست و پێت و
چاوم لە چاوتدا
گرێ بخوا
سەر هەڵبێنێ و
عەتری سڵاوێکم بڕژێتە بەر دەستت
بەڵام سەرت هەڵنایەنی
سەیر دەکەم
بەو دەستە نەرم و نۆڵانەت
ئاوپڕژێنی حەوشە دەکەی
جار و بارەش
کارێزی دەنگ دەخەیە رێ و
گوڵ ئاو دەدەی
بە خۆم دەڵێم:
خۆزگە ئەمنیش حەوشە بایەم
تا بەو دەستە سپی و سۆڵەت
ئاوپڕژێنت بکردایەم
دەڵێم بریا خاکی گوڵ بام
تا بەو پەنجە نەرم و نۆڵەت
ژەنگی خەمت لە دڵ بربام
بەڵام هەی داخ

هەزاران ئاخ
نە حەوشەم و نە خاکی گوڵ
نە پێناوی خەیاڵ و دڵ
ئەمن قرچە قرچی جەرگم
هەوری تەم و سەمای مەرگم
کارم هەناسە ناشتنە
خۆزگە و بریا هەڵڕشتنە

**(...)**

ئەسپەندەرێکی کاڵ
ئاوێنەیەکی سوور
دوو چەپکە یاسەمەن
گوڵدەستەیەک چنوور
شاکاشییەک بزە
مەرِدۆشێ پێکەنین
دەیدەم بە دەستی شەنگە ژنێکی بە با و بیر
بیبا بە پێشوازی ئەو کچە خاوەن شکۆیەوە
وا کۆچی کردبوو لە گوندەکەم و گفتی داوە بێتەوە
ئەو گوندە پڕ لە هەستە کە زۆربەی بەیانیان
قۆڵمان لە قۆڵی یەک
ڕێواسی مزر و پرپرەمان دەستە کردووە
گیا دۆکولێو و کوزەڵەمان لێوە کردووە
شەوگاری دڵڕفێنی پایز و زستانی بەستەڵەک
مانگم دواندووە بۆی و قژم شانە کردووە
چۆپیم گێڕاوە بۆی و خەمم لێ رەواندووە

تۆزی خەمم لە سنگ و بەرۆکی تەکاندووە
ئەو گوندە پڕ لە نەخش و نیگارەی کە جار جار
ئاگای لە کەین و بەین و قەرار و مەدارمان بووە
گوێچکەی لە هەست و خوستی نیان و دیارمان بووە
ئاخر لە مێژە باوەشی ئەو مامزە سڵە
تین و توان و هێزی ژیان و گەشەی نەشەم بووە
ئەفسوونی عەشقی ئەو نیوەی گەزۆی وشەم بووە
رووباری حەز بووە، ئاونگی تاسەکەی
میسکی خوتەن بووە بۆنی هەناسەکەی
***
ئازیزە ژیرەکەم!
سێ رۆژە من لە بن ئەم تاقە دارە چاوەڕێم
ئاخۆ لە بیرتە ئەو تاقە دارە پرچنەی
دەتکوت بەهەشتە سێبەرە پڕ هەستە خەستەکەی
سێ رۆژی ئازگارە نە رۆژم هەیە و نە شەو
چاوم تەواوی دەور و بەر و جادە دوورە دەستەکان
دەمدەم دەپشکنێ:
قیبلەم بەڕێوەیە
ماندوو بووە،
تینوویەتی،
زاری وشک بووە
***
ئەی یادی سەوزی دڵ!
ئەی گوڵپەڕی ئەوین!

ئەو دەستە نەرم و نۆڵە لە دەستم گرێ بدە
بینێمە سەر دڵم
***
دەنگ دێ لە دوورەوە
دەنگ دێ لە دوورەوە، دەنگێکی ئاشنا
دەنگی کەژاوە دێ
دەنگی تەلیسمی سنگ و مەمی بەربەیانە دێ
دەنگی شەپۆلی عەشق
وا دیارە کەم کەمە میوانە جوانەکەم
نیزیک ئەبێتەوە
نیزیک ئەبێتەوە، ئاهەنگی پێکەنین
***
بڕوانە سوورە گوڵ!
بڕوانە بۆنی سوێسن و سووسەنبەر و چنوور!

## گۆڕستان

کە تۆ هاتی
بەهار ئەنگوت
خۆر پێکەنی و
بەختی نوستوو لە خەو هەستا
کە تۆ ڕۆیی
هەتاو گوم بوو
گوڵ پڕووکا
خونچەی ئەوین زەرد هەڵگەڕا و
من مامەوە و
گۆڕستانی خەونەکانم

*بۆکان*

## تاڤگەی نیگا

تۆخوا کەسم، جێم مەهێڵە!
تۆخوا چی‌دی ئەی ئاوێنەی دەردەکانم
جێم مەهێڵە!
لە تاریکی شەوی خەمدا جێم مەهێڵە
جێم مەهێڵە با گوم نەبم
با خورپەی خەم بەندی دڵم نەلەرزێنێ
با ڕەشەبای دووریی باڵات
بەژنی ساوام نەژاکێنێ
ئەمن ئاوی گۆزەی سوورم، لێڵم مەکە!
ئەمن مەلی باغی شیعرم، مەمتارێنە!
با هێلانەم لێ‌نەشێوێ
ئەمن بەری داری هیوام
مەموەرینە، با نەشەمزێم!
خوای هەستم، مەمفەوتێنە!
با گۆرانیم تێدا نەمرێ
من مامزی شاخ و دەشتم، مەمرەتێنە!

با لەم شوێنە تەریک نەبم
مەمئەنگێوە، با لە خوێن و خۆڵ نەگەوزێم!
زنەی عەشقم، بە بێ ئاویی وشکم مەکە!
گوڵی شەوبۆم، مەمژاکێنە!
هەوری وشەم، بمبارێنە!
چاوی گەڵام، بە بزیەک بمدوێنە!
خەڵفی ساوام
بە ئاوازێک بمرەوێنە!
چاوەڕوانی تاڤگەی نیگام
بە ماچێکی تاسەشکێن
پاراوم کە!
پاراوم کە...!

*لەندەن، نەخۆشخانەی چێلسی ئەند ویست مینستر*

## شەتڵ

ئازیزەکەم
وە بیرت دێ پار نا پێرار
زەردەپەڕی ڕۆژئاوایەک
دەستی یادم
لە سەر گۆنات
بە قامکی دڵ،
شەوبۆی ڕنی؟
سوور هەڵگەڕای کوتت
شەوبۆ نابێ هەڵبوەرێ؟
وە بیرت دێ پار ئەو دەمە
نیوە شەوێکی مانگە شەو
وەک لاولاوێ
بە باڵاتدا هەڵگەڕام و
پەنجەی لێوم
لە سەر کولمەت شەتڵی چەقاند؟
مۆڕ بوویەوە و کوتت:
گوڵ ناسکە، مەیشەمزێنە!

ئازیزەکەم
وە بیرت دێ ئەمساڵ نەورۆز
چاوی برسیم
لە ئامێزی بەرۆکت دا
بە وشەی دەست گەڵای وەراند؟
بە ئەسپاییش
لە سەر شەونم خەمی چنی؟
رووت وەرگێڕا و کوتت
شەونم نابێ تەم دایگرێ!
گەڵاش نابێ پەڕپەڕ کرێ!
کەچی گوڵم
شەوبۆ و شۆڕانیان هەڵوەراند
گوڵیان شەمزاند
لە بن هەموو داری بەرێ
باوەش باوەش خەمیان چەقاند!
بێ هەست و خوست
شەونمیان کوشت
گەڵایان ناشت
خەفەتیان رشت
تۆش رۆیشتی
من مامەوە و باڵای کورتی شیعرەکانم!

*۷۵/۴/۲*

## هەوار

خەیاڵەکەم!
خەیاڵەکەت
شەڕابی خەم ڕەوێنمە
هەواری دڵ ڕفێنمە
خەیاڵەکەت
گڕە، گزنگە، دڵگرە
شەقاوی دەنگە، خەندەیە
تەوێڵی ژینە، وێنەیە
خەیاڵەکەم!
خەیاڵەکەت
تەواوی تان و پۆی تەنیم
دەماری شیعرە جوانەکانی
لێ جنیم
بە دووتەوەم
بە دووتەوەم
هەتا وڵاتی هەڵفڕین
هەتا هەوێڵی موعجیزە
هەتا دەگەم بە تۆ
بە دووتەوەم

## بۆن

کە ڕۆژ هەڵات
دەشت و دەر و سووچ و پەنام
لێدەبێتە بووکی باڵات

کە شەو داهات
لە شار، لە دێ
لە کەژ، لە زێ
بۆنی تۆ دێ

*تاران*

## هەناسە

وەک شیعرێکی گڕ تێبەر بوو
بمهۆنەوە!
بە لاوێچێ ئاوی لیخن
بمشۆرەوە!
بە کزەبای دەرد و وەرهەم
بمتەکێنە!
بە تەم
بە مژ
بە هەناسە
بمدوێنە!

## واژەی ئەوین

دێ
بۆنی تۆ دێ
بۆنی سنگ و مەمکی تۆ دێ
لە سەر گوڵی کوڵمەی ئاڵت
واژەی تازەی ئەوین دەڕوێ
خرمەی خرخاڵەکانت دێ
خشپەی پێڵاوەکانت دێ
بۆنی پەنجەی نەرم و نۆڵت
دەشت و چیا و چەم دادەگرێ

## ئاخۆ

ئاخۆ ڕۆژێ بە چاوم ئەیبینم
بێتەوە بۆ گەلم هەلی شادی؟
ئاخۆ دوژمن لە خاکەکەم ئەڕوا
دێ شنەی بای بەهاری ئازادی؟

ئاخۆ دایکانی پیری دڵ سووتاو
لە شەپۆلی هەتاو ئەبن ڕازی؟
ئاخۆ لاوانی گورج و زەحمەتکێش
ڕەشبەڵەک ساز ئەکەن بە شانازی؟

ئاخۆ ئەو ڕۆژە دێ کە تەم لاچێ
لە هەموو شوێنەکانی کوردستان؟
ئاخۆ ئەو ڕۆژە دێ خودای گەورە
وەک شەبەق ڕوون بکا شەوی کوردان؟

ئاخو ئەو ڕۆژە دێتەوە دیسان
مامزی خەندە بێتە سەر لێوان؟
ئاخۆ یاران لە بەند ئەبن ئازاد
چاوی دڵ ڕوون دەبێتەوە پێیان؟

ئاخۆ شەو شەق ئەبێت و نووری هەتاو
لە پەڵە هەوری خەم وەدەر دەکەوێ؟
شۆڕە لاوی وڵاتی شیعر و بزە
ئاخۆ لەو لێژە رژدە سەر دەکەوێ؟

بەڵێ پێم وایە بەندی خەم دەپسێ
بەندیخانەی خەفەت دەبێ وێران
دوژمنی گەل هەموو لە خوێن دەگلێن
دێتەوە هەل بە جارێ بۆ کوردان

ئاخ چ کاتێکی خۆشە ئەو ساتە
کە دەراوی هەناوی شەو دەدڕێ
دەشت و دەر دێتە پێکەنین و سەما
دەنگی کوند و قەلی چەپەڵ دەبڕێ

## لەشی فرمێسک

لە تاوی بێ کەسی شەو تا بەیانی
لە بینایی دوو چاوم خوێن ئەڕێژم
لە باتی هەڵمژینی لێوی دڵدار
لە سەر کوڵمەم لەشی فرمێسک ئەنێژم

نە کەس دێ تا بزانێ بۆ نەخۆشم
نە کەس دەرمانێ دێنێ بۆ برینم
نە دڵسۆزێ بەدی دێنم نە یارێ
نە ئاواڵێ دەبینم بۆ گرینم

نە "هێمن" لوتفەکەی جارانی ماوە
نە "سوارە" شیعری جوانم بۆ دەنێرێ
نە "هاوار[1]" حاڵ و ئەحواڵم دەپرسێ
نە "پشکۆ"[2] گوێ لە شیعرم رادەدێرێ

خودایە! دێوی تەنیایی منی کوشت
لە عەرزی دام و دەردی پێ هەڵێنام
خەمی خۆم و خەمی یارانی ناکۆک
وەکوو ئاگر دڵ و جەرگی دەرێنام

۶۲/۱۲/۲۵

[1] نازناوی نەمر عەلی حەسەنیانی (هاوار)ە
[2] نازناوی هەوەڵی "چاوە"یە

## شەوی شاعیر

بە دەنگێکی خۆش لە بەر دەرکەوە
بانگی کرد: ئازیز دەرکەم لێ وەکە
گوتم نامۆیە ئەو دەنگە خۆشە
گوتی پڕشنگم، نازم بۆ مەکە

بە هەڵەداوان دەرکەم لێ وەکرد
دیتم هەر وەک بووک خۆی لە گوڵ داوە
دەتکوت مەلایک چاویان رشتووە
یان گوڵخونچەیە و خەرمانەی داوە

بە پەنجەی نەرمی پەردەکەی لادا
بە ناز و نیم ناز هاتە ژوورەوە
وەک تامەزرۆیەک مەقنەی فڕێ دا
قژی خستە دەر هەر لە دوورەوە

پرسیم چۆن هاتی بەم درەنگانە
گوتی من شەمی شەوی تۆم ئەمشەو
لە نێو شادەشتی شیعرەکانتدا
کانی و مامز و کەوی تۆم ئەمشەو

بە تاڤگەی نیگا لەرزاندی دڵم
گوتی شاعیر کوا چرای شەوخەوت؟
بۆ سفرەت ئەمشەو رانەخستووە؟
کوانێ شەڕاب و پەیمانەی شەوت؟

گوتم ئەی ئاسکی سڵی خۆش رەوتم
هەڵبەستەکانم چرای شەوخەون
جام و سوراحی و مینام بۆ چییە؟
فرمێسکەکانم شەڕابی شەون

زەردێکی هات و کوتی کە وایە
بۆم پڕ کە جامێ بەو سەر پەنجانەت
وا چاکە ئەمشەو بێخود بم لە خۆم
بە سیحری ئاسۆی ئەو چاوە جوانەت

جا هەستە شیعر و دەفتەر وەكۆ كە
ئەمشەو من دەبمە شیعری دیوانت
لەرەی مەمكانم بۆت دەگرن چۆپی
تا گزنگی رۆژ دەبمە میوانت

ئەو شەوە نوستم لە باوەشیدا
هەر وەكوو دڕكێ لە پەنای گوڵێ
بەیانی كاتێ لە خەو ڕاپەڕیم
دیتم رۆیشتووە بێوەی پێم بڵێ

ئەی خودا ئەوە خەو بوو یا خەیاڵ
كە ئەو بەهارەی لێ كردمە پاییز
یان بە هوشیاری چاوم پێی كەوت
بلووری سنگی پڕشنگی ئازیز...

## کێڵگەی برین

لە مێژە عاشقی تۆم و دەزانم
کە هەرگیز لێوی تۆ نانێمە سەر لێو
ئەتۆ کیژێکی جوان و نەرم و نۆڵی
ئەمن وەک کوندەبوو، رووگرژ و بەدنێو

ئەمن باڵی برینداری هەناسە
ئەتۆ ژیر و لەبار و نازداری
ئەمن وەک داری چاکی وشک و بێ بەر
ئەتۆ هەر وەک گوڵی سووری بەهاری

ئەمن ئەسرینی دەرد و دووکەڵی خەم
ئەتۆ تەرپۆش و گورج و دڵ رفێنی
ئەمن گۆڕی خەیاڵ و دۆزەخی لەش
ئەتۆ بێ رەحم و توند و دڵ شکێنی

ئەمن کێڵگەی برین و زامی ناسۆر
ئەتۆ تورت و تەڕ و تازە و لە سەر خۆ
ئەمنناڵەی نەی و خەونێکی ئاڵۆز
ئەتۆ پڕشنگی خۆر و سیحری ئاسۆ

ئەتۆ شاد و ئەتۆ شۆخ و ئەتۆ شەنگ
ئەمن وەک کوندەبوو رووگرژ و بەدنێو
بە دڵ خۆشم دەوێی ئەمما دەزانم
کە هەرگیز لێوی تۆ نانێمە سەر لێو

٤٢/٦/٢٢

## دیل[١]

ئەی شەم و شەوبۆ و شەمامە و شۆڕەبیم!
هەستە دیواری ترس بشکێنە، بێ!
بووکی قژ زەردی وڵاتی ئارەزووم
بەندی دڵ زیاتر لەوە مەپسێنە، بێ!

ئەی تریفەی پڕ لە ورشەی مانگەشەو!
شۆخ و شەنگم، پەلکە زێڕینەم، گوڵم!
سۆزی هەڵبەستم، گڕم، چرپەم، چپەم!
تین و تاوم، مامزی خەندەم، دڵم!

ئەی خەیاڵی ناسکی پۆلی نیگام!
تۆ هەناسەی ئەوپەڕی ژینی منی
ئە فسوونی یادت بەهاری هەستمە
گەرچی کفرە، دین و ئیمانی منی

---

[١] وەرگێڕاوی شیعرێکی فارسی شاعیر خۆیەتی.

ئەی حەکیمی ئەو دڵەی زاماری من!
سنگی شەو بدڕە، لە ئامێزم گرە
شەتڵی پەنجەت بەستەیە، گۆرانییە
داوی عەشقە، پێکەنینە، ئاگرە

بمخە نێو پەرژینی باغی باوەشت
با بە جارێ ببمە دیلی دەستی تۆ
پۆلە ئەستێرەی نیگاهت، دەربڕە
با لە ڕێم دەرکا، دوو چاوی مەستی تۆ

ئاخ ئەی ماجوومی پارێز و گوناە
دەست دە دەستم، با بچین بۆ شاخ و دەشت
دۆزەخ و قەسر و سیڕات ئەفسانەیە
دوورە وەعدەی حۆر و غیلمانی بەهەشت!

## (...)

گزنگی روونی بەیانانی دڵ!
شەمامەی سووری بێستانانی دڵ!
ئۆغر بێ کۆچت بۆ کوێ تێکناوە
مەلی کۆچ کردەی دارستانی دڵ!

دەترسم وەک مەم چۆڵگەم پەنا بێ
بە وێنەی فەرهاد رەنجم بە با بێ
یان هەروەک لاسی دڵ پڕ لە خوێناو
خەزاڵی جوانم لێ تەوەللا بێ

هەناسەی گەرمی رۆژانی ژینم!
کۆترە باریکەی باغی ئەوینم!
ئەی واژەی تازەی چەخماخەی بزەم!
چاوێکم لێ کە با تێر بتبینم!

دەردی من دەردی دەشتی بێ ئاوە
خەم و خەفەتم هەر بە لێشاوە
بە چۆکدا نایەم تا ماوم، بۆ کەس
مەرگی مام هەڵۆ ژینی قالاوە

ئەی واژەی تازەی شیعر و هەڵبەستم!
ئەی ئاسکی سڵی خۆش رەوت و مەستم
قەستەم بەو کاتەی بۆنی ژوانت دێ
هەر ماوە بە جێی خوا بتپەرەستم

بە سرتە و چرپەی ئەو داوەی ئەبرۆت
بە پشکۆی گەشی ئەو گۆنایەی خۆت
گەرچی درێژە شەوگاری دووریت
بەڵام تا ماوم کڕنۆش دەبەم بۆت

ئاسۆی ژیانم بزەی هەڵبەستم!
ریحانەی دەوری باغی مەبەستم
بووکی رازاوەی خەیاڵی جوانیم
......................................................

ئەی واژەی تازەی چەخماخەی ژینم!
ئەی هیوای وەرزی دنیای یەقینم!
لە شار و لە دێ و لە دەشت و لە دەر
دەچمە هەر لایەک سایەت دەبینم

## (...)

من دەشتم، ئەتۆ ئاسۆ
من تووڕەم، تۆ لەسەرخۆ
من داوەتم، ئەتۆ دۆ
شتێی کردم چاوی تۆ!

من خەمبارم، ئەتۆ شاد
من ئەسیرم، تۆ ئازاد
من دیلم، ئەتۆ جەللاد
هاوار لە دەستی تۆ داد؟

من زستانم، تۆ بەهار
من کوێستانم، تۆ رووبار
من حەوشەم، ئەتۆ تەلار
ئەمساڵیش خۆزگەم بە پار!

من نەهاتیم، ئەتۆ هات
من تاڵم، ئەتۆ نەبات
من هیچم، ئەتۆ ئاوات
هەی بمرم لە بەر وەفات!

من مەمم، ئەتۆ زینی
من شەمم، تۆ شەمزینی
من باغم، تۆ پەرژینی
تۆ تان‌وپۆی ئەوینی!

من باڵندەم، تۆ داوی
من توونیم، ئەتۆ ئاوی
من پووشم، تۆ لافاوی
ئەتۆ سیحری هەتاوی!

من مەجنوونم، تۆ لەیلای
من وامەقم، تۆ عەزرای
من هەناسەم، تۆ هەوای
جێی لێ نەبێ، تۆ خودای!

١. نەهاتی، بۆ گوتت دێم و نەهاتی؟
نەهاتی بۆیە گرتوومی، نەهاتی
بهاتبایەی گوڵم، هاتت دەهێنا
چ خۆشە هات، بە نەحلەت بێ نەهاتی!

٢. گوتم کەمتر لە جەرگم بەردە بۆسۆ
گوتی مەتڵەب؟ گوتم ماچێک؟ گوتی بۆ؟
گوتم ئاخر ئەوا مردم لە دووریت
گوتی مردن لەکوێ ئاوایە؟ لاچۆ

٣. بە ترپەی پێیەوە خشپەی گەڵا هات
کە لێم دوور کەوتەوە هەور و هەڵا هات
بە دووی کەوتم بڵێم ئیفتارە؟ بۆکوێ؟
کەچی نەمگرتەوە و دەنگی سەڵا هات

٤. کچێکی نەرم و نۆڵ و مەززەداری
لە جوانیدا وەکوو دەنکی هەناری
بە مەمکانت بڵێ، پەنجێرە داخەن
کە فێری بەی ڕنینن، خەڵکی شاری!

٥. به لەچکەت بێژە ئاگری لێ دەبارێ
لە کوڵمەت عارەقی گوڵ، دێتە خوارێ
بە دەسماڵت بڵێ "با" دەست بزێوە
بچێ، ئەو بسکە زەردانەی وەشارێ!

٦. دوو چاوانت دەڵێی دەریایە، شینە
پەڕی کوڵمەت وەکوو پشکۆ بەتینە
بە تیرێکی موژەت بمپێکە، ئەمما
بە ماچێ بۆم دەوا کە ئەو برینە!

٧. چ خۆشە تیشکی کوڵمەت، تاوی من بێ
چ خۆشە بانگەوازت، ناوی من بێ
چ خۆشە ماچێ لەو دوو لێوە ئاڵەت
لە کاتی توونیەتیدا، ئاوی من بێ

٨. خەیاڵم ڕادەژێنن چاوی مەستت!
دەبزوێنن وشەی دڵ، هەستی خەستت
شەوانە کاتێ نامەت بۆ دەنووسم
لە پەنجەی با دەئاڵێ، بۆنی دەستت

٩. بە لەچکەت بێژە ئەگریجەی وەلادا
خەم و دەرد و پەژارەی من بە با دا
بە ئامێزت کە ڕووباری ئەوینە
بڵێ ڕەحمی هەبێ، ئەمنیش پەنا دا

١٠. خەیاڵم ڕادەژێنن، چاوی کاڵت!
گڕ و تینم وە بەر دێنن، خەیاڵت
بە ئاواتی بە ناحەق کوژراوم
لە قەبریشدا وەدی دێنم جەماڵت

١١. پەڕی زولفت وەدەرخە، مەقنە لادە!
هەموو درد و خەم و کۆسپم بە با دە
بە واژەی دارِژاوی لێوی ئاڵت
لە سوجدەشدا هەمیشە تۆم لە یادە

١٢. لە سووچی لەچکەوە، هەنیەی دیارە
گەزیزە و شەونم و شەوبۆ، بە بارە
چ خۆش بوو شانەیەک بایەم لە سەریا
کە دابێنم قژی ئەو تازە یارە

١٣. دڵم وەک ڕوومەتی سوورت بەتینە!
لەشم وەک تیری چاوت ئاگرینە
ئەگەرچی هەروەکوو بووت دەتپەرەستم
کەچی ئەو چاوە بازەت لێم بە قینە

١٤. بە میوانم بن ئەو دوو چاوە جوانەت!
بە ئامێزم بن ئەو جووتە مەمانەت
بەسە! چێژی فیراقم پێ‌مەچێژە
وە بەر تیرم دە بەو ئەبرۆ کەوانەت

.١٥ گوتی پردێکی هەڵبەستین و بەستم
گوتی مەمکۆلەکانم بمژە، گەستم!
لە لێوی ناسکی ماچێکی دامێ...
کە چەند ساڵە لەبەر ئەو ماچە مەستم

.١٦ گوتم ئەی مامزی باغی مەبەستم
هەتا ماوم لە دونیا، دەتپەرەستم
بزێکی هاتە سەر لێو و بە عاستەم
سەری هێنایە پێشێ، لێوی گەستم

.١٧ گوڵی شەوبۆ ئەدی شەو، بۆنی نایە
شەمی تاسە، ئەسیری دەستی بایە
شەمامە و شەشپەڕ و شللێرە، سیسن
خودا ئەی بۆ بەهاری ئێمە نایە؟

.١٨ لە دەرکەیدا گوتم کێیە؟ گوتی گوڵ
گوتم کێ واوەتی هێنا؟ گوتی دڵ
گوتم بەینێکە لێم ناپرسی؟ فەرمووی
سەعاتێ دڵ لە یادت نەبووە غافڵ

.١٩ گوتم لەیلم! دەڵێن گۆڕاوە مەیلت
گوتی باوەڕ مەکە، ناگۆڕێ لەیلت
گوتم ئاسۆی دڵم تاریکە! فەرمووی
مەترسە، ڕوونە ئەستێرەی سیوەیلت

.٢٠ گوتم ئەی خاوەنی هەست و گڕ و تین!
وەرە با عەهد و پەیمانێ ببەستین
گوتی بەو شەرتە تا ئەو ڕۆژە دەمرین
لە سەر ئەو شەرتە هەر وا ڕابوەستین

.٢١ گوتم ئەی نۆ گوڵی باغی خەیاڵم!
گوڵاڵە و نێرگزی ساڵانی ساڵم
وەرە بەو پەنجە نەرم و ناسکانەت
دەوا کە دەردەکەم دەردت لەماڵم!

.٢٢ گوتم شەرتە هەتا ئەو ڕۆژە دەمرم
وەکوو مەم غەیری تۆ، دڵدارێ نەگرم
گوتی ئەمنیش بە بێ تۆ شەرتە وەک زین
هەموو ئاواتەکانم بەرمە قەبرم

.٢٣ گوتت دێم و نەهاتی ئەی گوڵی من!
لەمەش زیاتر نەهاتی سونبوڵی من؟
لەلای خۆی تۆ کچی کوردی و کچی کورد
دەڵێن هەرگیز درۆ ناکا، دڵی من!

.٢٤ گوتم چاوی خومارت دڵتەزێنە
پەڕی کوڵمەت وەکوو گوڵ دڵڕفێنە
گوتی مەستت دەکا، عەتری مەمانم
ئەگەر ڕۆژێکی دەر بێ لەو کەلێنە

٢٥. گوتم چۆمی نیگاهت چەند بەرینە
گوتی تاسەی ئەوینیشم بە تینە
گوتم ئەمشەو درەنگی دێمە ژوانێ
گوتی نا نا، کەژاوەم ئاگرینە

٢٦. لەمێژە دیلی دەستی چاو ڕەشێکم
لە زیندانی ئەوینیدا بەشێکم
کە شەو دادێ منی بێچارە تا ڕۆژ
بە ئاواتی بەهەشتی باوەشێکم

٢٧. بە ئیمانم، بە ئاواتم، بە دینم
بە فرمێسکم، بە جەرگی پڕ برینم
بە خوێنی ڕۆشنی هەڵبەستەکانم
خەمی تۆ ئاگری بەردا لە ژینم

٢٨. ئەوەندەی دڵ دەڵێ، تۆ دڵڕفێنی
ئەوەندەی چاو ئەبینێ، خەمڕەوێنی
بە حاڵێ لەچکەکەت لادە، گڕم گرت
چ جوانە کوڵمە بۆ ماچی نهێنی

٢٩. بە مەرگی تۆ لە عەشقت مەستی مەستم!
بەسە تەفرە، عەزیزی دوورە دەستم!
ئەگەر تەفرەت بدەم ڕەببی لە ناکاو
پشووم لێببڕی، گڕ بەر بێ لە هەستم

.٣٠ پەڕی کوڵمەت گوڵم! چەند دڵڕفێنە
لەرەی سنگت کەسم! چەند خەمڕەوێنە
کچێنەی شەو کە دەدڕێ چەندە جوانە
ئەوەندەش باوەشت، عیللەتپەڕێنە

.٣١ وەکوو کۆتر گوڵم کەوتوومە داوت!
لە عەرزی دام شنەی بای بسکی خاوت
وەرە لێوم بە لێوت بمژە تاوێ
کە سەرخۆش بم لە بادەی جامی چاوت

.٣٢ دوو چاوانت دەڵێی دەریایە ئەی گۆڵ!
دەڵێی بازێکی بێ پەروایە ئەی گوڵ!
بەهار و پاییز و زستان و هاوین
لە سەر حاڵێکە هەر ئاوایە ئەی گوڵ!

.٣٣ پەڕی زولفت وەکوو ڕەشماری گیانە
ڕفەی چاوت، پلیکانی ژیانە
ئەگەرچی ناسکە تاڵی مژۆڵت
کەچی بۆ من وەکوو تیغی دەبانە

.٣٤ لە درەکوبانیماڵت پاسەوانم
لەنێو باغی قژتدا باغەوانم
ئەتۆ شیرینەکەی قەسری خودایی
ئەمن فەرهادی بێ ناوونیشانم

.٣٥ به بۆنەی تۆوەیه هاتوومه ئێره
دەنا چاوم لەمێژه لێره تێره
وەره ئەی شاسواری شاری جوانی
به تاقه ماچێ میوانم که خێره!

.٣٦ به بۆنەی تۆوه بۆنی دێ هەڵاڵه
به بۆنی تۆوه بۆنخۆشه گوڵاڵه
به بۆنی تۆوەیه شەیدایه نێرگز
به بێ تۆ بوون و بۆنی گوڵ بەتاڵه

.٣٧ له چوارینه دەچێ، ئەو لێوه ئاڵەت
له شیعری نوێ دەچێ ئەو ورده خاڵەت
نیگاهت وەک غەزەل وایه، دەپێکێ
ئەوینداران و دڵ دێنێته حاڵەت!

.٣٨ ئەتۆ شابسکی شیعر و پێکەنینی
ئەتۆ چەپکەی بزه و ئاهەنگی ژینی
ئەتۆ باغی هەزار ئاوازی هیوای
گزنگی شەونم و لوتکەی ئەوینی

.٣٩ ئەمن گۆڕی خەم و هاڵاوی شینم
ئەمن هەوری تەم و کڵپەی برینم
ئەمن جۆگەی هەنیسک و چۆمی تاسەم
پەژارەم، مەینەتم، تەرمی ئەوینم

٤٠. بە باوە خۆم دەبەستم دێمەماڵت
لە خەودا کەمکەمە، دەخزێمە پاڵت
بە هاورێشمی قژت جۆماڵ ئەکەم دڵ
وەکوو تامەزرۆ ئەمژم لێوی ئاڵت

٤١. بەڵێنی دا شەوێکی بێتە ژوانێ
لەسەر دیدەم بە نەرمی پێیە دانێ
بە برژانگم بڕووشێنی بەری پێی
ئەویش وەک من، فەنا ئەندەر فەنا بێ

٤٢. بڵێی کەی سەر کەمە سەر ئەو سەرینەت
بەبێ هەست بێمە سەر ئەو جێ و سەرینەت
ئەگەر هات و بە لێوم لێوتم گەست
بە ماچێکی دەوا کەم ئەو برینەت

٤٣. بەهارە سەردەمی هەور و هەڵایە
دەمی هاژەی چەم و ئاهەنگی بایە
شنەی سروە، هەناسەی شیعری پێیە
خەیاڵم هۆگری چاوی گەڵایە

٤٤. دڵی کەیلم شەڵاڵی یادی یارە
بەرەو شاری وەنەوشە، بێقەرارە
هەناسەی نێرگز و لەنجەی گەزیزە
دەڵێن زستانی خەم ڕۆیی، بەهارە

٤٥. له گەرمێن و له کوێستان و لەسەر ڕێ
له شارستان و دارستان و لادێ
تەنانەت کاتێ شەوبۆ دێته خەمڵین
به تەنیا بۆنی تۆ دێ، بۆنی تۆ دێ

٤٦. هەناسەت هەر وەکوو ئاوی حەیاته
بزەی لێوت وەکوو نوقڵ و نەباته
ئەوه تۆ چی، گڕی یا نه تەلیسمی؟
که ڕۆژ و شەو دڵی من هەر له لاته

٤٧. بڵێی خەندەت لەسەر لێوم سەما کا؟
بڵێی زولفت، پەژارەی من به با کا؟
وەره تۆ ئەو خودایەی دەیپەرەستی
هەناسەت بێنه با دەردم دەوا کا!

٤٨. خودا ئەو گەردنه کێله، چ جوانه
چ توند و تۆڵن ئەو جووته مەمانه
چ خۆشه توانەوه لەو باوەشەیدا
که ئاسۆگی دڵ و باغی ژیانه

٤٩. ئیجازەم پێ بده شەو بێمه ماڵت
گڕوگاڵێ بکەم بۆ ورده خاڵت
سەرم دانێمه سەر ڕانت هەتا ڕۆژ
گرێدەم دانەدانه زولفی کاڵت

٥٠. نیگاهت جەرگی لەتلەت کردم ئەی داد!
ئەسیری ژانی کردم داد و بێداد!
ئەوەی دەرد و خەمە، دەمدەیتێ ئەمما
بە تەنیا یەک بزە ناکەی دڵم شاد!

٥١. پەپوولەی شەو وەکوو قەقنەس دەسووتێ
گوڵە فرمێسکە هەر دێ و خۆش ئەکا جێ
چ خۆش دەکرێتەوە قفڵی دڵی من
بە چاوپێکەوتنی کیژانی لادێ

٥٢. ئەتۆ چاوی دڵ و عەتری سڵاوی
ئەتۆ شاری بزە و هێزی هەناوی
ئەتۆ بارانی عەشق و بۆنی ژوانی
شەڕابی، شەونمی، هێشوی هەتاوی

٥٣. ئەمن تابووتی سنگ و گۆڕی چاوم
ئەمن بەژنی شەو و داوی پساوم....
ئەمن مەرگی بزە و ئەسرینی دەردم...
هەناسەم، دووکەڵم، شووشەی شکاوم...

٥٤. دەچم بۆ سەیری چەم هەر تۆ دەبینم
دەچم گوڵ دەستە کەم هەر تۆ دەبینم
لە شاخ و دەشت و بەند و شار و دێ، ڕوو
لە هەر کوێیەک دەکەم، هەر تۆ دەبینم

.٥٥ هەموو دەشت و دەوەن زیندانە بێتۆ
گوڵ و غونچە و چەمەن، بێگیانە بێ تۆ
بە چاوانت قەسەم ئەی شاژنی شیعر
خەمی دنیا لە من میوانە بێ تۆ!

.٥٦ بە هاوارم وەرە، بیمارم ئەمشەو
لە کێو و دەشت و دەر، بێزارم ئەمشەو
بە قەت ڕووباری خوڕ، سوارە هەناسەم
بە قورسایی تەمەن خەمبارم ئەمشەو

.٥٧ شەوانی شەنبە چەند ناخۆشە شاری
کڕ و بێدەنگ و بێ کڕنۆشە شاری
نە بۆنی گوڵ، نە عەتری شۆڕە لاوێ
لە کۆڕی خەم دەچێ، ناخۆشە شاری

.٥٨ گرێپووچکەی خەمم، زووخاوی مەرگم
پلیکانی شەوم، هەنگاوی مەرگم
برووسکەی قین و دەشتی شۆرەکاتم
هەناسەی گەرمەشینم، داوی مەرگم

.٥٩ بە قووڵایی خەفەت دەردم گرانە
بە قورسایی تەمەن، جەرگم لە ژانە
نیشانەی یەککەمم قوڵپەی هەناسە
هەنیسکم یەک لە دووی یەک سەد نیشانە

.٦٠ خەم و دەرد و خەفەت گرتوویە شانم
پەژارە بۆتە یار و هاوزمانم
دڵی تەنگ و زنەی دیدە و کزەی با
بە جارێ خورپەیان خستۆتە گیانم

.٦١ بەری ڕووناکی بگری، تەم وەدی دێ
پەژارە و مەینەت و وەرهەم وەدی دێ
برینی ماچ و خەونی کاڵ و ئەسرین
ئەگەر دەست دەن بە دەست یەک خەم وەدی دێ

.٦٢ گوتم ئەی سێوە سوورەی باغی ژینم!
وەنەوشە و سوێسنی دەشتی ئەوینم
وەها پێکاومی تیری نیگاهت
شکاوە تازە باڵی هەڵفڕنیم

.٦٣ گوتم دا بێ بە ئامێزم بە تاوێ!
گوتی کوا هاودەمن، پیرێک و لاوێ
گوتم ئاواتی ماچێکت منی کوشت
گوتی ناگەیتێ هەرگیز، بیری ناوێ

.٦٤ گوتی دەردی ئەوینم دڵ تەزێنە
گوتم ئەو دەردە بۆ شیعرم هەوێنە
گوتی تیری موژەم عاشق دەپێکێ
گوتم چەند خۆشە بای ئەو باوەشێنە

٦٥. ئەتۆ پەرژینی باغ و دەشتی تاسەی!
ئەتۆ بۆنی بزە و عەتری هەناسەی
ئەتۆ خەرمانی عەشق و مۆمی یادی
گوڵی، بەندی دڵی، کەوباڕی خاسەی

٦٦. ئەمن خەندەی شەو و گۆڕی خەیاڵم
ئەمن ڕووباری لێڵ و خەونی کاڵم
ئەمن هەڵدێری ژان و شەونخوونیم
خەمم، دەردم، پەژارەی دوورەساڵم

٦٧. شەکەت ماوم لە هەورازی خەمتدا
کەسەر ماوم لە داوی پەرچەمتدا
گوڵم هێندەت لەدوو وێڵم، دەترسم
شەوێک گوم بم لە کووچەی پەرچەمتدا

٦٨. لە گێژاوی خەمتدا بێ قەرارم!
لە داوی پەرچەمتدا، دەردەدارم
ئەگەرچی مەستی ڕووباری نیگاتم
لە پێناوی خەیاڵتدا خومارم

٦٩. گزنگی پێکەنینت دڵرفێنە!
چڵی ئاوازی یادت خەمڕەوێنە
ئەگەرچی کوشتمی دەردی ئەوینت
بەڵام ئەو دەردە بۆ شیعرم هەوێنە

.٧٠ لەژێر ئەگریجەدا مردن چ خۆشە!
پەنا بۆ خاڵ و خەت بردن چ خۆشە!
گوشینی زەردە مەم، دەرمانی دەردە
لە باوەشدا مەلێ کردن چ خۆشە!

.٧١ بە خشپەی پێ، ئەمن مەتلێنەوە تۆ!
لە سەر تۆقی سەرم مەخولێنەوە تۆ
بە بۆنی سنگ و مەمک و عەتری کەزیە
برینی کۆنی من، مەکولێنەوە تۆ

.٧٢ چەنم پێخۆشە یار و هاودەمم بی
چەنم پێخۆشە گوڵخونچەی دەمم بی
بە ڕۆژا حاڵ و ئەحواڵم بپرسی
لە تاریکی شەوانەشدا شەمم بی

.٧٣ ئەمن "لۆقا" ئەتۆ عیسای مەریەم!
ئەتۆ شەمزینی بێوێنە و ئەمن شەم
بە تاقە ماچێ لەو دوو کوڵمە سوورەت
خەڵاسم کە لە دەرد و وەرهەم و خەم

## بیری رابردوو

وڵاتە خەمینەکەم!
وەبیرم دێ
دەریای دیدەت پڕ لە وشە
دنیای لەشت پڕ لە واژە
دەر و دەشتت خەیاڵاوی
ئاسۆ دوورە دەستەکانت
وەک شەبەق شەوقیان دەداوە

وە بیرم دێ
ئەسپی هەتاوت سەرکێش
منارەی دەنگت پیرۆز
ئەستێرەی نیگات سیحراوی
زنەی هەناسەت بۆنخۆش
هەموو شەوت مانگەشەو بوو

وە بیرم دێ
خەنجێری خۆرت بەرۆکی شەوی
دەدڕاند
بەرۆکی هیوات خەراجی لە رۆژ
دەستاند
گزنگی بزەت نازی بە مانگ
دەفرۆشت و
بارانی ئەندێشەت
خەڵفی ئاواتی لە دڵ دەڕواند

وە بیرم دێ
نەمامی باڵات گۆشەی ئێوارێکانی
دەڕازاندەوە و
رۆژانی هەینی
کوڕ و کچی شارە دراوسێکان
بە تایبەتی دەهاتنە سڵاوت و
کڕنۆشیان بۆ دەبردی

وە بیرم دێ
کانیاوە ژیکەڵانەکەی باغی قازی
توونیەتی دروێنەوانی ماندووی دەشکاند و
پۆڕە شۆڕەبییەکانی باغی مەلا عەلی
رێبواری لە پێ کەوتوویان
دەحەساندەوە.

وە بیرم دێ
ئاڵوباڵوە جوانەکەی باغی مەلا عەلی
هەموو هاوینان
بە دیاری دەبرا بۆ شاران و
لە ژێر سێبەری دارەکانیدا
دەستە دەستە
ژن و پیاو و منداڵ
دەحەسانەوە و زیافەتیان دەکرد

وە بیرم دێ
هەرزەکارەکان
زۆربەی ئێواران
لەو باغە دڵڕفێنەدا
بە تەپڵ و تووزەلە، چۆپییان دەگرت و
بە گۆرانی حەسەنە کوێر و عەبە چکۆل
هەڵیاندەخستەوە و
تۆزی خەم و پەژارەیان
لە دڵ دەشتەوە

وە بیرم دێ
قەیسیە ئاڵوێنییەکانی باغی حاجی برایم
شەکرە سێوەکانی باغی حاجی ساڵە
هەموو شەوێ
چلەی ماڵانیان دەڕازاندەوە

وە بیرم دێ
کاخاسە جووی زۆرزان
هێدی و هێمن و لەسەرەخۆ
بە زەردەخەنەیەکی زیرەکانەوە
بێئەوەی خوێندن و نووسین بزانێ
نوشتەی بەختی بۆ کیژۆڵە عازەبەکان
دەنووسی و
سەرقەڵەمانەی لێ دەسەندن

بەڵام شارە خەمینەکەم!
سەدان ئاخ و هەزاران داخ
شکاندیانی
بە سێدارەی فرمێسک و خوێن
خنکاندیانی
بە رەشەبای خەم و خەفەت
لەرزاندیانی
گڕیان لە شەوگارت بەردا و
سووتاندیانی
گومبەزییەکانیان خاپوور کردی
قەبرستانی کۆنیان وێران کردی
قسنی شێخ مەحموودیان
لێ رووخاندی
ئاوێنەی رووناکی تەمەنیان

لێڵ کردی
تۆزی خەمیان بە سەردا ڕشتی
بزەی جوانیان تێدا کوشتی
جەرگ و دڵیان ڕەش هەڵگێڕای و
ڕەحمیان بە منداڵیشت نەکرد

وڵاتە خەمینەکەم!
خەمێکی زەرد بە قورسایی کێوێک
خەفەتێکی خەنەیی بە درێژایی دەریایەک
تەمێکی ڕەش
بە پانایی ئەو ئاسمانە بەرینە
ئاسۆی دڵمی داگرتووە،
کوڵی گریان دەمبزوێنێ
پەنا دەبەم بۆ "ناڵەشکێنە"
ناڵەشکێنەی ناڵشکێن
زنجیری زۆردار پسێن
ناڵەشکێنەی بەرزی لەمێژینە
تۆزی داوێنی لە چاو هەڵدەسووم و
دەستی لە مل دەکەم و
لە قووڵایی دڵەوە لەگەڵی دەگریم
دەگریم بۆ پەڵکی هەتاوی
بۆ هاژەی عەشقی
بۆ بەختی نوستووی
بۆ کوڵمی کانیاوی

دەگریم بۆ فەسڵی بەهاری
بۆ لێوی تاسەباری
بۆ بەرۆکی دەنگی
بۆ کتێبی گزنگی
بۆ هەناسەی ئامێزی
بۆ کونەبای
پڕ بە دڵ دەگریم بۆ شێرە پیاوەکەی
بەگزادە
بۆ "عەلیبەگ"
بۆ شاعیرە پلە بەرزەکەی مەڵبەندی
تورجان
بۆ "ئاوات"
بۆ هەڵبەستی ئاراستەی "شەو"
بۆ هۆنراوەی پڕ لە وشەی
"خاسەکەو"
ئەو خاسەکەوەی
خاڵی رەش و سووری بە جووت رشتبوو
دەگریم بۆ هەڵۆی بەرزەفڕی
کێو و تەلان
بۆ شاسواری ئەدەبی موکوریان
بۆ "سوارە"
بۆ "تاپۆ و بوومەلێڵ"
بۆ "خەوەبەردینە"
بۆ "دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت"

بۆ "هەڵۆ"
بۆ خەوە بێهەستانەکەی و
بۆقافڵە بێوەستانەکەی
دەگریم بۆ خودای دەنگ و گۆرانی
بۆ "حەسەن زیرەک"
بۆ "نەمام نەمام" و "هەوری لار" ی
بۆ "قاسپە قاسپی کەو" و "کەویار" ی
بۆ "ناڵەشکێنە" و "باران بارانە" ی
بۆ "رەزیە" و "کەتان کەتانە" ی
دەگریم بۆ دەریای علیم و
چەخماخەی ئازایەتی
بۆ "مەلا هادی"
بۆ سەرچاوەی هەست و هەڵبەست
بۆ "مەلا حیسامەدین"
بۆ شەتاوی شیعر و شوعوور
بۆ "میرزا ئەسەدوڵڵا"
بۆ دەروونی هەڵقرچاوی "مەلا ئەبووبەکر"
بۆ خەتە خۆشەکەی "سەعیدی مەلا حەسەن"
کوڵی گریانم هەروا لە جۆشە
زەلکاوی فرمێسکەکانم
هەر هەڵدەوەرێن

سەر بەرەو خوار شۆڕ دەبمەوە و
بەرەو "قەڵا" رێگە دەبڕم

"قەڵا"ی داگیر کراو
قەڵای حەوشە و حەسار نەماو
قەڵای کۆنی شۆرە شکاو
قەڵا
قەڵای هەمیشە بەهار
قەڵای ساحیب دیوان و تەلار
قەڵای دڵ بریندار
قەڵای "سەردار"
قەڵای بەرزی لەمێژینە
قەڵا
ئەمجار لەگەڵ قەڵا دەگریم
دەگریم بۆ بورجەکانی
بۆ ئاو و بۆ ترومپا و بۆ درگاوبان و
بەرهەیوانی
دەگریم بۆ گڕی هەناسەی
بۆ عەسای فەرمانی
بۆ سەربانە بۆن خۆشەکەی
ئەو سەربانە ڕێک و پێکەی
کە رۆژێک
مامۆستای نەمر "هەژار"
چووە ژێر ئالای سێ ڕەنگی
کوردستان و
بە هەموو هێزی خۆی چریکاندی
"لاوەکان! نامووسی نۆ ملوێنە ئەم ئالایەمان

هەرکەسێ خۆشی نەوێ کۆستی کەوێ
رەبی وەبەر خەنجەر کەوێ"

هەنیسک بەرۆکم بەرنادا
ژاکاو و شڵەژاو
رووله مزگەوت دەکەم
مزگەوتی جومعه و جەماعەت
مزگەوتی تورجانیزاده و قزلّجی
مزگەوتی کۆنی لەمێژینه
مزگەوتێ که رۆژانی هەینی
دەرک وبان و دەر و دەشتی
پڕ دەبوو له ئەهلی نوێژ و رۆژوو
پڕ دەبوو له پیاوی خوداناس و دڵپاک
که بیر لێ کردنەوەی به قەولی
هۆنەری گەورەی کورد "نالی"
"دڵ دەبێ به ئاور و
ئاو به چاودا دەکا عوبوور"
دڵم بڕوایی نادا بچمه ژوورێ
شەکەت و سەر لێشێواو
له پەنای درگاکەی دادەنیشم و
پشت دەکەمه لێژی قەڵا و
چاو دەبڕمه حەوزه گەوره
حەوزه گەورەی خەمڕەوێن
مەڵحەمی دڵی به کوێن

حەوزە گەورەی سەر داپۆشراو
حەوزە گەورەی قوڕ بە سەردا کراو
حەوزە گەورەی تەم بە سەردا کشاو
خەم بە سەر داتەپاو
کە ئیتر نە قووڵە و نە بێ بنە و
نە ماسی خاڵ لە گەردنی تێدا ماوە
تەم بە سەر هەر دوو چاومدا دەکشێ:
ئەوە بۆ وات لێ هات حەوزە گەورە؟
ئەوە بۆ وا کەنەفت کەوتی؟
پەنجێرەی خەیاڵی ئەویندارەکان بووی،
خۆ تۆ زەمانێ دڵت پێ دەکراوە
هەواڵی رووناکایی بووی
دەک ئەوەی ئەو دەردەی دایەی
کوڕی مرێ
کۆستی کەوێ

بیرەوەرییەکانم لرفە دەکەن و
فرمێسکەکانم دێنە خوارێ
لە عالەمی خەیاڵدا
دەست دەکەمە ئەستۆی حەوزە گەورە و
ئەمجار لە گەڵ حەوزە گەورە دەگریم
دەگریم بۆ شەپۆلە جوانەکانی
بۆ ئاوە رووناکە ساردەکەی
کە لە چاوی قرژاڵیش جوانتر بوو

لە هەر چوار تەنیشتەوە
بەرەو کووچە و کۆڵانی شاری جاری دەبوون
دەگریم بۆ جۆگەلە خیزەڵانییەکانی
کە هەموو ئێواران دەبوونە هەوارگەی
کیژۆڵە لەش کەروێشکەکان و
ئاسکۆڵە شلوملەکان
بە گۆزەی سوور و جەڕەی عەجەمی
ئاویان لێ هەڵدەگوێست
دەگریم بۆ شەوە سپییەکانی دەوروبەری
بۆ ئەو شەوانەی دەیان نەونەمامی
جوان چاک و چالاک
وەک مەلەزانی ئازا
توند و تۆڵ و ڕێک و پێک
خۆیان تێدەخست و
بۆنی ئەوینیان تێدەڕژاند و
بەم جۆرە ئاوپڕژێنی دڵی پڕ لە ئەوینی
خۆیان دەکرد و
بۆ ئەوەی چاودێران بزانن
چ مەلەوانێکی وریا و بەکەڵکن
سکەی دووشاییان
لە عەرزی حەوزەکە و
لە کون و کاژێڕی
ئەو هەموو قەوزە رواوانەدا دەدۆزییەوە
دەگریم بۆ ئەو ڕۆژانەی

لە ئێوارە جوانەکانی بەهاردا
گەنجە لەسەر مرادەکان
بە کەوای ئەتڵەس و پشتێنی پەشمینەوە
لە دەوری حەوزێ
رادەوەستان و
لەگەڵ کیژۆڵە
چاو بە خومار و گوێ بە گوارەکان
چاوبڕکێنەیان دەکرد و
دەستیان بۆ لەسەر سەر دادەنان
بیر دەکەمەوە لەو زەمانەی
بە فەرمانی سەرداری گەورە
لە داوێنە پڕ هەوێنەکەی خوڕێنک
رەشبەڵەک دەگیرا و
سەدان کیژۆڵە و شەنگە ژنی جوان
بە تایبەت تەسک و لووسە مووسایییەکان
چاو بەناز و غەمزەساز
بە دەهۆڵی کا حەمە حوسەین و
زوڕنای عەبە چاوەش و
بۆن و بەرامی حێل و مێخەک
دەچوونە کۆڕی داوەتەوە و
لاوە زیت و وریاکان
سەرخۆش و پڕ لە جۆش
لە تاو کەوتنەوە تا خۆرپەڕین
دەیانکوتا و

بە دەست گوشین و چپە و سرتە
ئەو کچە خڕ و خوڵانەیان ساز دەکرد و
جێژوانی نیوەشەویان بنیاد دەنا

بیرەوەرییەکانم
پەستا پەستا دەهۆنمەوە
فرمێسکەکانم
ناگەڕێنەوە نێو ماڵی چاوەکانم و
ئەمجار بیر دەکەمەوە لەبەر
دووکانان
لە بەربانگەکانی رەمەزان
حەمەدەمینی ساڵحی ئەلیاس
لە جەرگ و دڵە بێدەغەڵەکەی
رەحمان چاوشین
لە دەنگە خۆشەکەی
حەمە حوسەینی خاسافیە
کە لە شەوە درێژەکانی پایزدا
لە بەر قاوەخانەکەی خۆی
تێی هەڵدەکرد:
"لێی ئاڵاوە کەسک و عابی
شەرمەندەی قاپیەی خودا بی
سەر هەڵێنە بێبەڵا بی
کراس زەردی کراس زەردی
کراس زەردێم لێ ئاڵاوە

کراس زەردێم بۆ بکەن بە بووک
بیبەن بۆ باغی میراوا".

بیر دەکەمەوە لە دەنگە نەرمەکەی
عەلی حوسەینی کەچەڵ
کە هێدی و لەسەرەخۆ
بە مۆزەیەکی دڵتەزێنەوە دەیکوت:
"ئەرێ خەجێ خەزێمە
پێ بنێ وەبان گلێنە
پێ بنێ وەبان گلێنە"

بیر دەکەمەوە لە قەیسەری
لە چراخانەکانی شەوانەی میعراج
لە رازاندنەوەی دووکانەکان
لە گوزەری خەیاتەکان
لە شەوکاری شەوانەی پایز
لە حەمەدەمینی سەیزادە
لە وەستا رەسووڵی میرزا خەلیل
کە روحیان وەبەر کەواوپاتۆڵ دەهێنا
بیر دەکەمەوە لە مزگەوتە چکۆلە
لە حەمامی خەزێنە
لە کیسە کێشانی عەبە کەڵیچە
لە فۆتە گرتنی حەسەنە کەڕ
بیر دەکەمەوە لە مەدرەسەی شەیبانی

لە مامۆستا شێخ حەسەن
لە مام میرە
بیر دەکەمەوە لە بەستەنییەکانی
قادری وەستا رەسووڵ و عەبە زیقاوە
لە نێو ساجیەکانی رەحمان هەنگوین
لە هێڕەڵماسییە کولاوەکانی
حەمەی مل وشتر و شەنگە
لە بانگەوازی:
"هێلکەی کولاو خوێی لە سەر؟
لە دەنگە وەک زەنگوڵەکەی
حەسەن مەلوو:
نانی جومعە رەحمەتی خوداتان لێ بێ"
بیر دەکەمەوە
لە دەفە و مناجاتی سەید نەجمە
لە حووی ئەڵڵای دەروێش مازوو
لە شەربەتاوی وەستا رەحیم
"دانت بۆ تێکەم یا ئاو؟"
لە مار گرتنی خوری
لە سییەوە چوونی کەریمە شەل
بیر دەکەمەوە
لە فەنگوڕافەکەی فەحوڵڵای قاوەچی
لە سەفحەکانی
سەید عەلی عەسکەری کوردستانی
"ئەی دەنا کورتێ کورتە باڵا

پێم بڵێ کێتان لەماڵە
ئەی دەنا کورتێ چت لێ کردم
بە جوانی خۆت پیرت کردم"
فرمێسکەکانم لە سەر ماڵە کۆنەکەمان
جێ خۆش دەکەن
دەگریم بۆ برووسکەی تەگبیر و شەپۆلی عەقڵ
بۆ حاجی برایم و حاجی سوورەی حەمە سەققزی
بۆخەرمانی خێر و بەرەکەت
بۆ حاجی بابا
بۆ بڵێسەی کار و زەحمەت
بۆ حەمەساڵەی وەستا عەلی
بۆ هەرێمی مەندی و هێمنی
بۆ فەحوڵڵای مامە حەمە
بۆ کەژاوەی حەیا و ئەدەب
بۆ عەبدوڵڵای حاجی حمەد
بۆ مەکۆی تین
بۆ حاجی حەمە ڕەشیدی حاجی برایم
بۆ شنەبای ژین
بۆ محەمەدی پاڵەوان
بۆ مەرگی ناوەختی جۆلانەی حەق و عەداڵەت
بۆ عەزیزی حاجی ئیمام کە زۆر بێڕەحمانە
لەتوپەت کرا
دەگریم بۆ مەرگی ساوای خالیدی ئیلخانیزادە
بۆ عەزیزی حاجی کەریم و

بۆ ڕەحمانی حەمە کەریم سەرایی

دەگریم بۆ لاوە جوانە مەرگەکان
بۆ هەستە کوژراوەکان
بۆ ئەوینە خنکاوەکان
بۆ ئاواتە نێژراوەکان
دەگریم بۆ حاجی قاسم
بۆ حاجی قاسمی نەبەز
بۆ حاجی قاسمی ئازا
بۆ حاجی قاسمی توند و تۆڵ و وریا
بۆ حاجی قاسمی خەباتگێڕ
بۆ دەستە و دایرە بەهێزەکەی
بۆ عەبڵا ئێرانی
بۆ عەلی میرەبەگ
بۆ کەریمی خازینەت
بۆ سەید تەها
بۆ حەمە رەئوفی مەلا ڕەحمان
کە دژی هەموو دەرەبەگانی هەرێم
پیاوانە هەستانە سەرپێ و
کونە مشکیان لێ کردبوونە قەیسەری
بیر دەکەمەوە لە بەرەبەیانی رۆژی
جێژنی قوربانی ساڵی ١٣٣٢
ئەو بەرەبەیانەی
کە بە فەرمانی زۆردارە ملهوڕەکان

کاتێ زۆربەی خەڵکی بۆکان
خەریکی ساز کردنی کاسەی جێژن بوون
بە دەستی حەمە ڕەشیدی رۆستەم پاڵەوان و
مینەی رەشید ناسکێ و
سێ چوار نۆکەربابی دیکە
هورروژمیان بردە سەر ماڵی حاجی قاسم و
پڵاوی جێژنیان لێ هەڵڕشتن و
بەو رۆژە موبارەکە
ماڵە تازە دروست کراوەکەیان
ئاور تێبەردا و
هەموو ژن و منداڵەکەیان ئاوارە کرد

بیر دەکەمەوە لە دوکتۆر فردریشی ئوتریشی
بۆ هەموو تەبابەتە بەکەڵکەکانی
بۆ ئەو رۆژانەی بێحەسانەوە
دەچووە سەر دەیان نەخۆش و
سەدان دەردەداری لە دەرمانگا
چاو پێ دەکەوت و
هیچ نەخۆشێکی بە ناهومێدی
نەدەگەڕانەوە

بیر دەکەمەوە لە زوڵم و زۆری
زاڵمی خودانەناس
حەمەدەمینی مەحموودئاغا

کە بۆ نموونە
حاجی بایزی مارف عەجەمی
تەنیا بەو گوناهە گەورە
کە پارچەی بۆ ژنەکەی بە قەرز نەناردبوو
ساڵانێکی دوور و درێژ
لە شاری باب و باپیری خۆی
تەوەللا کرد و
دەیان و سەدان و هەزاران
زوڵم و زۆری تر و
بێڕەحمیی تر

بیرەوەری وەختە شێتم کا و
بۆ ئەوەی ماوەیەک
لەم گێژاوە دوور کەومەوە
سەری خۆم هەڵدەگرم و
بەرەو پردی میراوا ڕێ دەکەوم
کۆڵانە تەنگەبەرەکەی
جوولەکەکان
ماڵی دینێ و کەیلان
دەرک و بانی عەبلای سۆفی قادر و
سەید عەبدوڵلای مامۆستا
ماڵە وەک کاروانسەراکەی
سەیزادە تەیبە
ماڵی ئەحمەدی حەمەتەپی

جۆگەلە ئاوەکەی گەڕەکیماڵی قازی و
ئەحمەدی کەیخەسرەو بەگ
بەجێ دێڵم و
بە بەردەمی باخچۆڵەکەی
حەمە رەسووڵی گڵێنەدا
کە ئەلعان هەزار ماڵی لێ ڕواوە
ڕەت دەبم و
دەگەمە سەر "گۆمی سەرسەکۆ"
گۆمی سەرسەکۆش لەش بریندار
گۆمی سەرسەکۆی شەق کراو
وشک هەڵگەڕاو
تین و تاو تێدا نەماو
گۆمی سەرسەکۆی بۆن و بەرام ناخۆش
بێدەنگ و بێخرۆش
گۆمی سەرسەکۆی لەمێژینە
ئەمجار لەگەڵ گۆمی سەرسەکۆ دەگریم
دەگریم بۆ مەلەوانەکانی
بۆ بەرجەوەندەکانی
بۆ سەمفۆنیای بۆقە چاو سەوزەکانی
دەگریم بۆ گۆمە شینە
بۆ قۆرغی چناران
بۆ تاقە دارە
بۆ باغی مامۆستا
بۆ ئاشی خانم

بۆ پردەبازان
بۆ کوورەخانە
دەگریم بۆ باغی میللی
بۆ قۆرغە چکۆلە
بۆ گۆلی مەردانبەگ
چاوم هەروا هێلانەی فرمێسکە
بیر دەکەمەوە لە ئاشی باشی
لە قۆپیەکەی مەحموودی حەسەن ناچیتی
لە دار سنجووەکانی حەمەڕەزا شەل
لە ئەشکەوتی حەمە خەجێ
لە دار هەرمێ
لە گۆمی حەمەباریک
لە بەربەردان
لە کێلەشین
لە قوللە
لە قەبرە جوولەکان
لە زاخەکان
لە چاکە چکۆلە
لە گڵەسپی
لە کێوە بەرداویلە
لە چاڵە بەفرەکان
لە بەفربڕینی ئەحمەدی مامۆستا
بیر دەکەمەوە لە باغەکانی سۆفی حەمە
کە هەموو هاوینان

شاگرد و خەیاتە مێزەر لارەکان
لە دوانیوەڕۆکانی هەینیدا
لەگەڵ مامۆستاکانیان
سۆرانییان هەڵدەکرد و
لە بن سێبەری دار تووە پڕ لە بەرەکەی
سەرداریيان دەبرژاند و
لەبەر خۆیانەوە نەرم نەرم دەیانکوت:
"تازەم زانیوە بۆکان بۆتە شار
تێدا هەڵکەوتووە دوو خەڵفی چنار
یەکێکیان ئامین وەک دەنکی هەنار
ئەوی دیش سارا شۆخ و مەزەدار"
دەگریم بۆ باغی شێخ قادر
بۆ باغە چوکە جوانەکانی
سوڵتانە شێت و قالە سێسەر
بۆباغی حاجی برایمی حەبیب

وڵاتە خەمینەکەم
خەم بە لەشمەوە نووساوە
فرمێسک وەک شەونمی بەیان
لە سەر روومەتم قەتیسە
شێعرەکانم وە هانکە هانک
کەوتوون
قەڵەمەکەم شەکەتە
بەڵام شەپۆلی خەیاڵ

بەرۆکم بەرنادا و
بەملا و بەولامدا دەدا
ئارەزوو دەکەم تا باران و باڕن ببێ
تا ئەستێرە و ئەستێر ببێ
ئەستێرەی رووناکی ئەوپەڕی لەشت
رێبواری ماندوو بحەسێنێتەوە
ئارەزوو دەکەم
منارەی دەنگت پیرۆز
روانگەت جوان و بەرین
شەقاوی خەیاڵت بێسنوور
بێشکەی روخسارت سەحەت سووک و
بخووری هەڵمی هەناسەت بۆن خۆشتر بێ
ئارەزوو دەکەم
کانیاوی ژیانت
دیسانەکە بزێتەوە
بۆن و بەرامی پەرە بگرێتەوە و
شنە بای باڵی هەتاوی باڵات
جارێکی دی ئاهەنگی ئەوین بڵاو بکاتەوە و
جا ئەمجارە منی ماندوو، منی تینوو
وەک ئەویندارێکی تامەزرۆ
خۆم دەخەمە ژێر رێژنە بارانەی قژتەوە
عەتری خەرمانی سنگت هەڵدەمژم
لە رووباری رۆژتدا مەلە دەکەم
گۆشەی ئێوارەکانت دەلێسمەوە

ئاخر وڵاتە خەمینەکەم
تۆ مەکۆی تینی
تۆ جۆلانەی ژینی
تۆ چەپکەی گوڵی
تۆ هومێدی دەرزی دوا رۆژی دڵی
تۆ شەتاوی ژیانی
تۆ شارە خونجیلانەکەی بۆکانی

١٣٧٤/١/١

## ئاکامی شین

ئامێزی پڕ بوو لە شیعر، کوڵی خەم لە کۆشیدا شەپۆلی دەدا، عەتری هەناسەی پیاوی مەست دەکرد، سەرتاپای ئەندامی جوانیی لێدەباری، دەتکوت تابلۆیە، هەموو گیانی رەشبەڵەک بوو. تۆزی رێگای لە خۆی تەکاند و چاوە خەو تێشکاوەکانی لە چاومدا گرێ دا و وردە وردە هاتە پێشێ و کوتی سڵاو. سڵاو لە پەنجێرە و لە خاک. چاوێکی لە دەوروبەری خشاند و کوتی: سڵاوێکی دیکەش لە پەژارە و لە پێنووس. منی دەناسی، منیش ئەوم دیبوو، بەڵام نەدەچوومەوە سەری. بێهەست و خوست لە لام دانیشت. چاوەکانی پڕ بوون لە دەریا، تەمی چارەنووس لە سەر روومەتی دەبیندرا. وەک دار خۆی رادەژاند. تاو نەتاوێ فرمێسکەکانی بە زمان دەلستەوە، بەرۆکی رووت بوو بەڵام گاڵتەی بە سەرما دەکرد، بە قامکە سپی و سۆڵەکانی پرچی دەهۆندەوە. زڵلەی پەژارە پێکەنینی تێدا کوشتبوو، لە دەشتی شۆرەکاتی بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەتلاوە، دیار بوو سەری لێ شێواوە، جاروبارە قژی خۆی دەڕنی، چەپکە گوڵێکی ژاکاوی لە ژێر چارشێوەکەیدا شاردبۆوە. دەیکوت بە خۆم نیە

کانیاوی بزەم وشک هەڵگەڕاوە، چارەڕەشم. کزەبای خەم هەر چوار تەنیشتی تەنیوم، خەوە رەنگاوڕەنگەکانم کاڵ بوونەتەوە. گۆرانی هەتاوم لێ بووەتە ئاوازی کوندەبوو. هەموو شوێنێکم لێ بووەتە چەرمی چۆلەکە، پێیان گوتووم پشت بکەمە خۆشەویستی و ئەوین لە خۆمدا بکوژم، تاریکایی رادەخەم و بە سەریدا دەڕۆم. بە شەو چاوم باش دەبینێ، جاروبارە کەروێشکێکی رەشی زلکوێر دەبینم کە پرچی خۆی بە هیچ دەهۆێنێتەوە، دەیکوت ساڵی ئەشکەنجە و زیندانم قەت لە بیر ناچێتەوە. برینەکانی نیشان دام هێندێکیان هێشتا هەر قووڵ بوون زۆربەی گۆشتەزوونیان نەهێنابۆوە، دەیکوت لە ترپەی باران دەترسم، قەت بە تەنیایی ناوێرم لە شەقامەکان پیاسە بکەم، جاروبارە شیعریش دەڵێم، بەڵام شیعری قەدەغە. بە پرمەی گریانەوە دەیگوت شەرتم بە خوێن بەستووە و خوێنم لەگەڵ فرمێسکەکانم تێکەڵ کردووە کە قەت هێلانەی پەڕەسێلکەی بێباڵ تێک نەدەم و گوڵی هیچ بەختێک نەکەمە پایز. دەیکوت کاتی دەستەملان نابێ تیر لە گورگی برسیش بدرێ. دەیگوت وێران کردنی کۆشکێکی عەشق لە وێران کردنی سەد مزگەوت گوناهترە لە کاتێکدا لەگەڵ من دەدوا چاوە جوانەکانی لەگەڵ ئاسمان تێکەڵ ببوو، لەوە دەچوو قورسایی دەردەکانی لەوانەش زۆرتر بێ، لە تەواوی ئەندامی هەناسە دەتکا، لە قووڵایی چاوەکانیدا بەرزترین لووتکەی ئەوین دەبیندرا، لە سەر لقی سەوزی قامکەکانی جوانترین چوارینەی خەم شین ببوو. دەیکوت من خوای خۆم لە نێو ئاورگەکانیشدا دەبینم، هەنیسکی دەدا و دەیکوت رووی دنیا رەش بێ خۆ من ئاوا نەبووم، ئاوا لە لایەک فڕێ نەدراوم، منیش وەختی خۆی دنیایەکم بوو، پەنجەکانم پڕ بوون لە ئەستێرە و دڵم سەرڕێژ بوو لە کارێز. دەیان مەلی بێدەنگ لە روحمدا هێلانەیان

کردبوو. دەیان کۆتری خۆشڕەوتی سپی باڵ وەخت و بێوەخت لەسەر شانم چینەیان دەکرد. بەڵام شووشەی ئاواتیان شکاندم، رۆحیان کوشتم، شیعرەکانیان لە دار دام، بەهاریان لێ ساندمەوە و پڕیان کردم لە پایز، فریشتەی شادییان لە سەر شانم هەڵفڕاند و لێواولێویان کردم لە خەم، بە دەستی زۆر پیاڵەیەکی لارووێری ژەنگاوییان دایە دەستم و هەوای برینداریان پێ چەشتم.

وا دیار بوو سەرڕێژ بوو لە پەژارە و بێزار بوو لە پایز. بە زۆر کەوتبووە قسە دەنا قسەی کەمتر دەکرد. دەیکوت پرسیار لە سەر پرسیار مێشکم دەجوون، چۆڕاوگەی برینەکانم پڕ بوون لە هاوار، دەتکوت لەگەڵ خوای خۆم شەرتم کردووە و ئەو شەرتەم بە خوێن بەستووە کە باوەشم لێواولێو کەم لە شیعری قەدەغە و کۆشی بیرم بە چیرۆکی قین بشارمەوە و بە وشەی بێدەنگ هەموویان بڕازێنمەوە، لە نێو هەردوو دەستیدا دڵئاوایی شەپۆلی دەدا دیار بوو ئەوەی دەیکوت راست بوون. رەشەبای بێکەسی لە تەوێڵیشی کاری کردبوو. پرچە ئاڵۆزکاوەکانی نەیتوانیبوو چرچی ملی داپۆشێ، دەیکوت برووسکەی رق لە نێو ناخی مۆخی ئێسکەنەکانمدا هاتوچۆ دەکا، دەنگی ناخۆش دەمارەکانی داپۆشیوم، چڕنووکی دێوەزمەی شەو کراسی ئەوینی دادڕیوم، گیانم لە چێژی دووری ئەستوور بووە، پێڵووی زام لقوپۆپی داری ژیانی داهێناوم، خەمی خەستی پێ نەگەیشتن درگای وشکەساڵی عازیەتی لێ کردوومەوە، لەگەڵ بەسەرهات دوژمنم، شەوانە خەوم لێناکەوێ، هەوای هیوام بریندارە، چاوەڕوانی مەرگێکی ناحەزم، ژەنگی هەناسە چوار پەلی رزاندووم، هەوری خەفەت بێوچان لە سەر سەرم دەگەڕێ. دالانی وڕێنەم

گەورە بــۆتەوە، ئەم دیـــوە زلەم پـــێ تەنـــگە، لە تەلاری تەنیاییـــدا تـواومەوە، هەمـوو دنیـا بە چـاوی نـامۆیی دەبینم، خەتـای خـۆم نییە، تۆوی نامۆییان تێدا چاندووم. دەیکوت پێم خۆشـە هەمـوو بەیانییەک لەگەڵ دەنگـی مەلا ئـاهەنگێ سـاز کەم و لەبەر خـۆمەوە ویـرەم بـێ. دەیکـوت پـێم خۆشـە دیسـانەکە بـڕوێمەوە. بەڵام تـازە درەنـگە، کـێ یارمەتیم دەدا؟ تەقیلەکانم وەکوو هیواکانم کۆنن، ماندوو مردوو و ڕەنج با بردووم، دڵم پڕە لە هیچ، نازانم ئەو هەمـوو خەم و پەژارەیە لە کوێ هەڵڕێژم؟

تازە چەنەی گەرم داهاتبوو، پێی خۆش بوو هەرچی خەمـی لە دڵدایە هەر بە سـەعاتێ هەڵیڕێـژێ! کەسـی لە مـن چـاکتر وەگیـر نەدەکەوت، بەڵام بە داخەوە من شـەکەت بووم ئاگری بێخەوی شـەوی رابـردوو پەپوولەی کاتمی دەسووتاند و شـەتڵی خەو لە باخچەی چاومدا شـین دەبوو، بە حـاڵ وەبیـرم دێتەوە کە دەیکـوت گـوێچکەی هەمـوو دڵێک کەڕە و چاوی هەموو دێوارێک کوێر. . .

## مریەمی خەیاڵ

کاتێ بە ڕێدا دەڕۆی مۆسیقای هەنگاوەکانت دەنگ دەداتەوە و سنەوبەری قەراغ شەقامەکان لە هەیبەتی پێڵاوەکانت دەنووشتێنەوە.
کاتێ شلکە بیزای قژت شانە دەکەی تریفەی مانگە شەو لە بێشکەی خەیاڵدا دەرەخسێ و خەو لە چاواندا دەکوژرێ.
کاتێ چاوە مەستەکانت بە کل دەڕێژی، کێوی سینا لە هۆش دەچێ و ئاسۆ دوورە دەستەکان کڕنۆشت بۆ دەبەن.
کاتێ بڕیار دەدەی بۆ ژوان، گوڵاڵە سوورەکان چۆپی دەگرن. شۆڕەبییەکان دەکەونە سەما، کۆتری هیوا دەگمێنێ، دیواری ترس درزی تێ دەبێ و باخچە بێچەپەرەکان مۆسیقای شادی وە ڕێ دەخەن.
بەڵام کاتێ خەمێکی سەوز داتدەگرێ لایلایەی ئاو دەبێتە هاوار و تازە بەرۆکی هیچ دارێک بزە دەرناکا.
ئەی مریەمی هەتا هەتا کچی ئەوپەڕی خەیاڵ، نازانم لە چ بەیانییەکی پڕ لە ئاوازدا مەلائیکە خۆشەویستەکانی خودا برژانگەکانی بە

سیحری پیرۆز ڕەنگاندووی کە بۆنی گوڵاڵە و مێخەک بە هەموو سووچ و پەنای ئەم مەڵبەندەدا بڵاو بۆتەوە.
نازانم لە چ شەوێکی پڕ ئەستێرەدا چاویان بە کلە سوبحانی ڕشتووی کە تاڤگەی نیگات کچێنەی شەو دەدڕێنێ و ئاسۆی تەمەن دەڕازێنێتەوە.
نازانم لە چ ئێوارێیەکی پڕ لە وشەدا خودای جوانی مەمکۆڵەکانی گەزتووی، کە عەتری نارنج و لیمۆ وڵاتی داگرتووە.
ئەی تۆ.... ئاسکی سڵی شیعرە ناتەواوەکانی ڕابردووم!
ئەی تۆ، نۆبووکی ڕازاوەی چوارینەکانی داهاتووم!
هەزار خۆزگە بە پار، بە پێرار، بەو ساڵانەی کە تاڤگەی نیگات دەشتی دڵی خەیاڵاویمی ئاوپڕژێن دەکرد و وەک ڕێبوارێکی ماندووی تینوو لە کانیاوی هەناسەتدا ئاوم دەخواردەوە، بەو ساڵانەی کە بۆنی سنگ و مەمکت شەتڵی بەژنی تەنیاییمی پاراو دەکرد و سەر پەنجەکانم لە ڕووباری بەرۆکتدا مەلەیان دەکرد، بەو ساڵانەی چرپە و سرتەی ئەوینی تۆ هێور هێور هەوری لەشی نەسرەوتوومی دادەپۆشی و تا درەنگانێک لەژێر هێشووی قژی تۆدا دەحەسامەوە.
هەزار خۆزگەم بە ڕابردوو، بەو کاتانەی هەموو شەوێ عەتری پشکۆی گۆنای گەشت بە شان و باهۆمدا بڵاو دەبوونەوە و لە ئامێزی پڕ لە وشەتدا لە هۆش دەچووم.
بە چاوی دڵ خۆشم دەوێی، خۆشم دەوێی وەک وێنەگر وێنەکانی، وەک مەزرایەک هەور و هەڵا و وردە باران، وەک شوانێکی دڵپڕ لە کوڵ شمشاڵەکەی.

## بێ تۆ هیچ

هەموو شەوێ لە ئاوێنەی خەیاڵمدا، پڕیشکەی پشکۆی مانگی ڕوومەتت دەوەرێتە سەر سنگ و بەرۆکم و خەو لە چاومدا دەکوژێ.
هەموو شەوێ هەر وەک شەماڵ تاوێک توند و تاوێک هێدی بەم لا و بەو لاتدا هاتوچۆ دەکەم و دەیان پەیامت بۆ بەجێ دێڵم.
هەموو شەوێ باغەڵی پڕ لە پرسیارت دەبێتە هەوارگەی لەشی نەسرەوتووم و کانیاوی هەناسەت خەڵفی ساوای باغی شەونخوونیم پاراو دەکا.
هەموو شەوێ شاری دڵم بە تەنیا بزەیەکت پاراو دەبێ و سەدەفی تەنیاییم بە سەرپەنجە ناسکەکانت دەکرێتەوە.
هەموو شەوێ زستانی خەم و پەژارەم بە هالاوی سیحراوی دەمی تۆ دەبێتە بەهارێکی کاکۆڵ زێڕین و لە ژێر سێبەری ئەوپەڕی قژە شانە کراوەکانتدا خەوم لێدەکەوێ.

هەموو شەوێ پێش ئەوەی خەو دڵم بگرێ، لە پیاڵەی بلووری چاوە خەو تێشکاوەکانتدا بە عارەقی تەوێڵت توونیەتی خۆم دەشکێنم.

هەموو شەوێ لە سوچ و پەنای تاریک و تنۆکی ئەم لا و ئەو لامدا دەستەکوتە دەکەم و لە تۆ دەگەڕێم. لە تۆ دەگەڕێم کە بۆت بە چۆکدا بێم و لە رووباری روومەتتدا مەلە بکەم.

لە تۆ دەگەڕێم کە دەستت بۆ درێژ کەم و هەرچی بۆنی دەست و پەنجەتە بیدزم.

من لە مێژە لەگەڵ تاسەت ئاشنام، لە مێژە مۆمی یادت لە شەوی تەنیاییمدا دەئاییسێ و بەیانی تەمەنم بە تاقگەی نیگات زێڕوەشان دەبێ.

لە مێژە نزرگەی یادت ئاسۆی دڵم دادەگرێ و کووچە و کۆڵانی خەیاڵم دەڕازێنێتەوە.

لە مێژە لە ئاوێنەی خەیاڵمدا وەک لاولاو بە باڵاتدا هەڵدەگەڕێم و بێئەوەی بزانی شەوی بێکەسی خۆم بە وێنەی تۆوە هەڵدەواسم.

من هەموو شەوێ هەزار جار بە دەست، هەموو ڕۆژێ هەزار جار بە چاو تۆ بانگ دەکەم.

ناوی تۆ وەک خوێن بە نێو دەمارەکانمدا هاتوچۆ دەکا و گزنگی بزە لە سەر لێوم دەنەخشێنێ.

دەنگی تۆ بێوچان لە گوێچکەمدا دەنگ دەداتەوە و خۆشەویستیم تێدا دەکێڵێ،

پەنجەی تۆ زامی کۆنی بێهاوزمانیم دەرمان دەکا و زنەی پڕ لە واژەی هەناسەت عەقڵ و هۆشم پاراو دەکا.
ئەی تۆ ڕێژنە بارانەی شادیهێن و دێوەزمەی شەو لەرزێن!
تۆ خونچەی شادی دەخەملێنی و شەمشەمەکوێرەی بەدفەڕ دەتارێنی.
تۆ کتێبی گزنگ دەخولقێنی و پەراوی پەژارە دەڕەوێنی.
تۆ باوەشت پڕ لە گوڵ، لە شۆڕان و سونبووڵ
تۆ داوێنت پڕە لە جوانی و لێواولێوە لە کامەڕانی
من لە تاریکی و لە ڕووناکیدا بێوچان وەک هەناسە هەڵتدەمژم و بە زمانی دڵ قسەت لەگەڵ دەکەم.
من گۆرانیبێژی عەشقی تۆم و هەموو شەوێ بە پەلکە بیزای قژت خۆم دەبەستمەوە.
من لە تۆدا دەژیم و لە تۆدا دەحەسێمەوە،
من تەنیا لە تۆدا دەمرم.
من بێ تۆ خەمبار، بێ تۆ دەردەدار، بێ تۆ هیچم
تۆ بەهاری، تۆ ڕووباری، تۆ چریکەی شۆڕەسواری، تۆ هەوارگەی پیر و جوانی، تۆ وشەی داڕێژراوی ژیانی،

تۆ کوردستانی!

## لایە لایەی دایکی وەفا

شەو بوو، نیوەشەو بوو، نا، بەری بەیان بوو، بەری بەیانیش نەبوو، رۆژ سەری هێنابووە دەرێ و تیشکی روومەتی خۆی لە سەر شاخە بەرزکانی کوردستان بڵاو کردبۆوە. چاوم هەڵێنا، وەتاغەکەم، وەتاغە سارد و سڕەکەم وەکوو هەمیشە چۆڵوهۆڵ بوو. بەڵام دایکم لە پشت سەرینەکەمەوە بە تاقی تەنیا دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو، چاوەکانی نەرم نەرم فرمێسکی دەڕژاند، دڵۆپی فرمێسکی لە مرواریەکانی زێ روونتر و گەشتر و پاکتر بوو، نازانم چی وە بیر کەوتبۆوە، بە دڵمدا هات ئەوە بۆ بێکەسی خۆی دەگری، مەعلووم نەبوو، چووزانم، دەشقەم بۆ بێبەختی و رۆژەڕەشی من دەگریا. جارجارە سەری پڕ هەنیسکی خۆی دەهێنا پێشێ و ماچێکی دەکردم و لەبەر خۆیەوە بە دەنگێکی ناسکەوە کە چاک دەمزانی، چۆن لە دەڵە پڕ خەمەکەی دێتە دەرێ، دەیلاواندمەوە و دەیکوت:

کوڕی خۆشەویست، گوڵ بەهارەکەم!
ئازیزی دڵی بێقەرارەکەم
تەماشا، دنیا چۆن رووناک بووە
لە مێژە رۆڵە رۆژ هەڵاتووە

لە نێو جێگەدا خۆت مەیلێنەوە
کەمێک رابردووت وە بیر بێنەوە
چاوت هەڵێنە، راپەڕە لە خەو
زۆر دەمێکەیە، کۆچی کردوە شەو
رانک و چۆخەکەت هەستە لەبەر کە
پشتێن ببەستە، کڵاو لە سەر کە
دەرکەوە دەرێ، ئازا، کوردانە
تێکۆشە کوڕم! مەرد و مەردانە
ئاخر تۆ بەندی دڵەکەی منی
لە باغی هیوا گوڵەکەی منی...

***

رۆڵە! داخەکەم وە بیرت نایە
زۆرم بۆ خواردووی خەم لە دونیایە
بە زگی برسی بەخێوم کردووی
بە ئاواتی دڵ بەڕێمدا بردووی
شەو تا بەیانی دانیشتووم لە لات
بە فرمێسکەوە کز کەوتووم لە پات
بە لانکەتەوە شل بووە دەستم
تاکوو کەم بگری، کوڕی سەربەستم!
ئاخر تۆ گیانی شیرینی منی
دەرمانی دەرد و برینی منی

***

رۆڵە گیان! هەستە، دەرکەوە دەرێ
رێگەکەت کەلە، سەرکەوە سەرێ

"من" و "رووناک" و "ئەنوەر" و کاکت[١]
لە بیر بەرەوە بۆ ئاو و خاکت
وەکوو ئاور بە، لە حاندی دوژمن
سەرت دامەخە، قەزات بێ بۆ من
ترس نەتگرێ، نەبەزی کوڕم،
بە داری دوژمن نەتەزی کوڕم!
خەمی لێدان و کوشتنت نەبێ
خەفەتی تەمی مردنت نەبێ
ئەمن بۆ مردن تۆم کردوە بە پیاو
پێم خۆشە بمری، تا دەر بکەی ناو
بۆ خاکی وەتەن، گیان بێقیمەتە
سۆرانی هەڵکە، رۆژی هیممەتە
ئاخر ئەم خاکە، خاکی کوردانە
جێ رمبازێنتی بێچووە شێرانە

***

رۆڵە! ئەوا من کورت و لەسەرخۆ
ئەوەی لازم بوو، شەرحم دا بۆ تۆ
ئەتۆش هەستە پێ، ئازا، بەشەڕەف
بۆ بەرزی وەتەن، خۆت دە بە تەلەف
دەنا تۆ کوڕی داوێنی من نی
"وەفا"ی هۆنەری خاوێنی من نی

---

[١] وەفا باوکی خۆی بە کاکە بانگ دەکرد

ئەو زەحمەتانەی کێشاومە لە رێت
یاکوو ئەو شیرەی کە وا داومە پێت
بە زەهری مارت، ئازادت ناکەم
هەتاکوو ماوم، قەت یادت ناکەم
دوعات لێ دەکەم لە لایەن خودا
هەرگیز لە عومرت نەگەی بە هیوا
بە تیغی دوژمن لەت لەت بێ گیانت
بە گوللە کون بێ سکی مەرجانت
گلێنەت کوێر بێ، بشکێ زمانت
بە کفلەکوونێ رەش بێ ژیانت
ئاخر فەرموویە، دانای سەرزەمین:
"مەردانە مردن، نەک حیزانە ژین"

رۆژنامەی کوردستان، چاپی تاران، ژمارە ۲۰، ساڵی ۴ (۱۷۴)،۱۹۶۲/۹/۱۹

## ڕەببی

ڕەببی نەبینی هەرگیز لە جۆشم
قەت لە گوێت نەیە، ئاهەنگی خۆشم
لەباتی شەربەت، زووخاو بنۆشم
بە سەد هیواوە کەفەن بپۆشم
بە دڵ بۆ وەتەن گەر تێنەکۆشم

ڕەببی لە دونیا ببمە دەربەدەر
جەرگم هەڵبدرن بە نووکی خەنجەر
ڕەنج و زەحمەتم بڕوا بە هەدەر
چاوم هەڵکۆڵن بە سپلەی نەشتەر
بە دڵ بۆ وەتەن گەر تێنەکۆشم

ڕەببی هەر ڕەش و ڕووت بم و هەژار
ببمە گیرۆدەی دەردی دووری یار
خەو و خۆراکم بێتە زەهرەمار

به بۆوەی نەکەم شەماڵی بەهار
بە دڵ بۆ وەتەن گەر تێنەکۆشم

رەببی هەڵوەریێ فرمێسکی گەشم
بە ژێر پێ کەویێ بەختی سەرکەشم
ئازیزم بمرێ لە ناو باوەشم
هەرکەس بە جۆرێ بڕفێنێ بەشم
بە دڵ بۆ وەتەن گەر تێنەکۆشم

رەببی لە ناکاو لاڵ بێ زمانم
ویشک بێ چاوەی هەڵبەستەکانم
سیس بێ شەمامەی باغی ژیانم
کوێر بێ ئەستێرەی روونی عاسمانم
بە دڵ بۆ وەتەن گەر تێنەکۆشم

رەببی بترازێ کۆڵەکەی ژینم
بڕووخێ پایەی دین و یەقینم
خوێن خواردنم بێ و خەم بێ سەرینم
لە عومرم رەنگی خۆشی نەبینم
بە دڵ بۆ وەتەن گەر تێنەکۆشم

*رۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ژمارە ٢١، ساڵی ٤ (١٧٥)، ١٩٦٢/٩/٢٧*

## بۆکان

"بۆکان" شارێکی جوانە
وڵاتی کوردستانە
لە چاوی بەد بەدوور بێ
هەمیشە پڕ لە نوور بێ
بەردی دەڵێی گەوهەرە
ئاوی وەکوو کەوسەرە
رەنگی چیاکەی گەشە
پیاو دەهێنێتە نەشە
شاخ و داخی هەموو خۆش
سەرچاوەکانی لە جۆش
کیژانی هەموو جوانن
بەکارن، خان و مانن
نەجیمن، رەش ئەسمەرن
نەرم و نۆڵن، دڵتەڕن

منداڵانی دڵ شادن
لە بەندی خەم ئازادن
فێڵ و فەرەج نازانن
ژیرن، مەعسوومن، جوانن
لاوەکانی سەربەرزن
رێک و پێکن، بە تەرزن
ساحیب شەرەفن، ئازان
مەرد و رەندن، بەحەیان
پیرانی هەموو زانان
ئەهلی کتێبن، دانان
لە نەتەویست بێباکن
ئەلحەق بە کەڵکن، پاکن
"قەڵای سەردار"ی جوانە
سەری وا لە کەیوانە
"سەرحەوز"ی ئاوەدانە
جێگەی بەزم وسەیرانە
"تەپی کولتەپەی" لە دوور
لە نێو دڵان دەخا نوور
"ناڵەشکێنە"کەی بەرزە
دەڵێی کێوی ئەلبورزە
"باخی قازی" بەهاران
زۆر خۆشترە لە شیمران
هاوین "باغی میرئاوا"ی
دەبێ هەر دانیشی لای

پاییز "باغی مامۆستا"ی
پڕ لە میوەیە هەر لای
خۆشە فەسڵی زستانی
پڕ لە بەفرە کوێستانی
دەشت و دەری رەنگینە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە

❊❊❊

بۆکان شارێکی جوانە
شاری جوانی کوردانە
بە چاو ئەگەر دوورە لێم
بە دڵ هەر نێزیکە پێم
شەرتم کردووە تا ماوم
هەتا دەبینێ چاوم
بە تیغ گەر لەتلەتم کەن
غەیرەز وی، نەگرم وەتەن

رۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ژمارە ٢٣، ساڵی ٤ (١٧٧)،١٩٦٢/١٠/١٠

## کچی کورد

کوتت: دێم و نەهاتی ئەی گوڵی من!
لەوەش زیاتر نەهاتی سونبوڵی من
لە لای خۆی، تۆ کچی کوردی و کچی کورد
دەڵێن: هەرگیز درۆ ناکا، دڵی من!

ڕۆژنامەی کوردستان چاپی تاران،ساڵی ۴، ژمارە ۲۶ (۱۸۰)، ۱۹۶۲/۱۰/۳۱

## جەرگی پڕ برین

به ئیمانم، به ئاواتم، به دینم
به فرمێسکم، به جەرگی پڕ برینم
به خوێنی ڕۆشنی هەڵبەستەکانم
خەمی تۆ ئاگری بەردا لە ژینم

ڕۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ساڵی ۴، ژمارە ٢٧ (١٨١)، ١٩٦٢/١١/٧

## بۆسۆ

ڕۆژێ لە ڕۆژان
لە ڕۆژە ڕووناکەکانی وڵاتی کوردستان
لەو ڕۆژانەی کە وەکوو کراسی ورشەداری بووک
شەبەقی دەدا و
هەر وەکوو کوڵمەی گەشی کچە دەوڵەمەند
شەق و ئاودار
لێوی بە تینی خۆر
عارەقی دەخستە نێو چاوان
نە دەنگی کوندەبوو، لە سەربانان دەهات
وە نە قەلە ڕەشە، لە سەر دیواران دەیخوێند
***
پەردەی کاڵەوە بووی دەرکەی وەتاغەکەم
لەپڕ لاچوو
چارشێو بەسەرێکی جوان

جوانتر لە فریشتەکانی عاسمان
بەناز و پێکەنینەوە
لێم وەژوورکەوت
کڵۆنجەیەکی مەخمەری سووری لەبەردا بوو
هەودای زولفی
لە ژێر تاسکڵاوێکی سووەروە
وەدەر کەوتبوو
بە چاویدا زوو ناسیمەوە
دڵدارە خۆشەویستەکەی خۆم بوو
کە بە قەولی خۆی وەفای کردبوو و هاتبوو سەرم لێدا
زەردەخەنەیەکی نەرم
لە سەر پەڕی لێوم دەرەخسی
بە نووکی پەنجە هاتە پێشێ
باوەشی پێدا کردم
"و بە ماچێکی تاسە شکێن"
عەقڵ و هۆشی لێسەندم
وەختێ وریا بوومەوە
بە پەنجە ناسکەکانی باوەشێنی دەکردم
باسکی نەرمی سەرینی سەرم بوو
***
ئەی کیژی نەرم و نۆڵی کوردا!
ئەی گوڵی هیوای من!
سوێندم بە جوانیت
تاسکڵاوی سەرت

پشتێنی کەمبەرت و
کڵۆنجەی مەخمەرت
ئاور لە جەرگم بەردەدا
***
ئەی کیژی توند و تۆڵی کورد!
ئەی لە خێڵ دوا کەوتووی قارەمانی هومێد!
سوێند بە مەرگت
پێکەنینی لێوت
بۆسۆ لە نێو دڵم دەخا
***
ئەی گوڵی هیوای من!
ئەی کیژی کورد!
ئارەزوو دەکەم هەمیشە جوان بی
دڵتەڕ و لەبەردڵان بی
تەنیا بەم جۆرە ئاواتم بێتە دی

۱۳۴۰/۸/۲۸

ڕۆژنامەی کوردستان چاپی تاران،ساڵی ۴، ژمارە ۳۱ (۱۸۵)، ۱۹۶۲/۱۲/۵

## لەشی فرمێسک

لە تاوی بێ کەسی شەو تا سبەینێ
لە بینایی دوو چاوم خوێن ئەڕێژم
لە باتی هەڵمژینی لێوی دڵدار
لە سەر کوڵمەم لەشی فرمێسک ئەنێژم

نە کەس دێ تا بزانێ بۆ نەخۆشم
نە کەس دەرمانێ دێنێ بۆ برینم
نە کەس دڵسۆزە بۆ ڕێگەی ژیانم
نە کەس هاواڵە بۆ شین و گرینم

نە "هێمن" لوتفەکەی جارانی ماوە
نە "پشکۆ[١]" شیعری جوانم بۆ دەنێرێ
نە "هاوار[٢]" حاڵ و ئەحواڵم دەپرسێ
نە "مەزهەر"[٣] گوێ لە شیعرم رادەدێرێ

خودایە! دێوی تەنیایی بە جارێ
لە عەرزی دام و دەردی پێ هەڵێنام
خەمی خۆم و خەمی یارانی ناکۆک
وەکوو ئاور لە بن جەرگی دەرێنام

*رۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ساڵی ٤، ژمارە ٣٢ (١٨٦)، ١٩٦٢/١٢/١٢*

---

[١] نازناوی هەوەڵی "چاوە"یە
[٢] نازناوی نەمر عەلی حەسەنیانی (هاوار)ە
[٣] مامۆستا نافعی مەزهەر (شپرزە)، شاعیری سەقزی

## کوندەبوو

دەمێکە عاشقی تۆم و دەزانم
کە هەرگیز لێوی تۆ نانێمە لێوم
ئەتۆ کیژێکی جوان و نەرم و نۆڵی
ئەمن لاوێکی بێ‌واز و پەشێوم

ئەمن شێت و پەرێشان و بریندار
ئەتۆ پاک و لەبار و نازداری
ئەمن بەندەی خەم و دەرد و نەدامەت
ئەتۆ پڕشنگی رووناکی بەهاری

ئەمن مات و لەخۆ بێزار و تەنیا
ئەتۆ رووت و تەڕ و تازە و لەسەرخۆ
ئەتۆ دڵخۆش و هیوادار و ئازاد
ئەمن دڵ پڕ لە زام و دەستەوئەژنۆ

ئەمن بێیار و بێدڵدارو بێکەس
ئەتۆ دڵدار و شۆخ و دڵڕفێنی
ئەمن بێچارە و مەزڵووم و بێدەنگ
ئەتۆ بێڕەحم و توند و دڵشکێنی

ئەتۆ باڵا بڵیند و شاد و رووخۆش
ئەمن وەک کوندەبوو رووگرژ و بەدنێو
بە دڵ خۆشم دەوێی، ئەمما دەزانم
کە هەرگیز لێوی تۆ نانێمە سەر لێو

*ڕۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ساڵی ٤، ژمارە ٣٣ (١٨٧)، ١٩٦٢/١٢/٢١*

## بە بۆنەی ٢٥ی بەفرەمبار و جێژنی گەورەی جووتیار

پەککوو! چەندە پەشێو بووم
چەندە کز و بەدنێو بووم
چەن دەستم دا بەر ئەژنۆ
بیرم کردەوە لە خۆ
بیر لە دوێنێ، لەو وەختە
بە بەرد و دار و تەختە
خانووچکەم دەکرد بە تاو
نەمبوو فکری نان و ئاو
هەڵدەستام و دەکەوتم
هەر دەمخوارد و دەخەوتم
کارم هەر پێکەنین بوو
بە سەر بردنی ژین بوو

❊❊❊

پاش ماوەییێکی درەنگ
دەموچاوم گرتی رەنگ

تووکی منداڵیم وەراند
چاوم بۆ دوا ڕۆژ گەڕاند
بووم بە کوڕێکی گەورە
کوڕی زەمانە و دەورە
بە توندی بۆ پێشێ چووم
داخڵی جەماعەت بووم
بە سەد ئاوات و هیوا
دەستم کرد بە تەقەللا
تەقەللا بۆ ژیانم
بۆ سەرخۆشی و بۆ گیانم
وەختێکی ورد بوومەوە
دەستم گرت بە ڕوومەوە
دیم میللەتێکی نەفام
زل و تڕقۆز و عەوام
دنیایان داگیر کردووە
نامووسی خەڵکیان بردووە
هێندە خودا نەناسن
هەر دەخۆن و دەماسن
پێیان خۆشە بەرەو دوا
مردبان کەسیان نەدیبا

هەر کە بیانزانیایە
یەکێک شتی بزانیایە
لێی دەبوونە نەتەویست
خۆشی ئەویان نەدەویست
بەڕیز دەستیان هەڵدێنا
پەلاماریان بۆ دێنا
زوو دەیاندا لە عەرزی
لێویان دەدروو بە دەرزی
خوێنی جەرگیان دەڕشت
خۆشییان لە دڵدا دەکوشت
***

لەو سەرودەمەدا بوو
من چاوم هەڵێنابوو
چاک و خراپم دەزانی
چاوم جوانی دەڕوانی
خەبەریان دانێ بە تاو
کە منداڵێکی بێناو
خوێندنی تەواو کردووە
داخڵی خەڵکی بووە
شیعر دەڵێ و شاعیرە
لەو کارەدا ماهیرە
لەپڕ دیتم وەک نەزان
دوور لە ئەخلاقی پیاوان

دەستیان کرد بە هەڕەشە
بە هەڕشە و گوڕەشە
بە بێ سووچ و بێتاوان
حەوایان دامە زیندان
تووشی حەبسیان کردم
ئاواتیان لەبیر بردم
بە بوختان و بە درۆ
بە کەڵەک و بە دهۆ
وایان تەشی بۆ رستم
نێویان بە پیس دەرخستم
بێزاریان کردم لە ژین
لە یار و ئیمان و دین
تا وام لێهات خۆم بخۆم
سەرم هەڵگرم و بڕۆم
یاکوو خۆم بخنکێنم
ئامانجەکەم بمرێنم
یا ئاور لە خۆم بەردەم
خۆم خەلاسی کەم لە خەم
هەرچی کۆشام و کردم
روحمیان پێ نەکردم
***
تاکوو لەپڕ شاهەنشا
سێبەری زاتی خودا
وەک موحەممەدی مەهدی

ئاواتی هێنامە دی
دەستی لوتفی دەرێنا
خێر و شانازی هێنا

*ناتەواوە*[١]

ڕۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ساڵی ٤، ژمارە ٣٩ (١٩٣)، ١٩٦٣/١/٣٠

[١] وەفا دوای کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژی ١٩٥٣ لە لایەن ئاغاکانی بۆکانەوە گیرا و درایە دەست پۆلیس و پاشان خرایە زیندان لە مەهاباد.
ئەم شیعرە لە ڕاستیدا کورتە باسێکی ژیانی شاعیرە و ئەوانەی وا بە "خەڵکانی نەفام" و ئەوانەی وا "دنیایان داگیر کردووە" ناویان دەبات، لە ڕاستیدا ئاغاکانی بۆکانن کە لە درێژەیدا دەڵێ: حەوایان دامە زیندان... تووشی حەپسیان کردم.
شیعرەکە دوای ئیسلاحاتی ئەرزی ساڵی ١٣٤١ (١٩٦٢) و بێدەسەڵات بوونی ئاغاکانی بۆکان گوتراوە و وەک لە سەرەتای کتێبەکەدا ئاماژەی پێکرا، وەفا لەو سەردەمەدا لە ترسی مار پەنای بردە بەر ئەژدیها و وەک زۆر ئەدیب و شاعیری دیکەی ناوچەکە، لە پەسندی شا و دابەش کردنی زەویدا شیعری هۆندەوە و وەک دەبینین لێرە بە شانوباڵی حەمەڕەزاشادا هەڵدەڵێت کە لە زوڵم و زۆری ئاغاواتی رزگار کردووە و "ئاواتی هێناوەتە دی".

## مزگێنی

بۆ پێشەوە جووتبەندە!
دنیا بە تۆوە بەندە
مزگێنی بێ کرێکار!
کرێکاری بێ ئازار
رزگاریتان هات لە خەم
لە هەوری چڵکنی تەم
لاقتان لە زنجیر دەرهات
رۆژی رووناکتان هەڵات
قەڵای بەدکارتان رووخا
زوڵمتان لەسەر نەما
پێک هات ئاواتی دڵتان
سووتا جەرگی دوژمنتان
لە گەڵ شادی بوون بە جووت

لێوتان وەکوو گوڵ پشکووت
سەر هەڵێنن بۆ دوعا
بڵێن: بژی شاهەنشا

***

بۆ پێشەوە جووتبەندە!
دنیا بە تۆوە بەندە
کرێکاری بە ئیمان!
بۆ پێشەوە بۆ ژیان
دەس لە دەستی یەکتر کەن
بۆ ئازادی هەوڵ دەن
هەڵپەڕن داوەت بگرن
ئەسرین لە چاوان بسڕن
ئەوانەی خوێنیان دەمژین
لێیان تێک چووماڵی ژین
رۆیی زەمانی دە دوو
عومری زۆردار بەسەر چوو
نەما بارانە و بێگار
لە سەر شانت کرێکار!
کە وا بوو بڵێن برا:
بەرقەرار بێ شاهەنشا

❊❊❊

بۆ پێشەوە جووتبەندە

دنیا بە تۆوە بەندە

شاهەنشای گەورە و بەڕێز

بە دڵ و ئیمان و هێز

بورجی ناحەزیی رووخاند

بەندی نۆکەریی پچڕاند

عەداڵەتی خستە دەر

وەکوو حەزرەتی عومەر

قەڵای زۆری تێک تەلی

وەکوو حەزرەتی عەلی

ئاواتی هێنایە دی

وەک محەممەدی مەهدی

دەسا تێکڕا دەستەجەم

دوور لە ناحەزی و لە خەم

بڵێین: تا ماوە دنیا

هەر زیندوو بێ شاهەنشا

❊❊❊

بۆ پێشەوە جووتبەندە!

دنیا بە تۆوە بەندە

بەڵێ جووتیاری ئازا!
برای نەبەزی وریا
مزگێنی بێ بە یەک جار
رووخا قەڵای ئیستیعمار
ئەوەی دوژمن بوو پێتان
دنیای تاڵ کردبوو لێتان
وا کولاوە برینی
کوژاوە قەڵای ژینی
بۆ پێشەوە جووتبەندە!
دنیا بە تۆوە بەندە
تۆش تا دەنگت دێ برا
بڵێ: بژی شاهەنشا

رۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ساڵی ۴، ژمارە ۴۱ (۱۹۵)، ۱۹۶۳/۲/۱۳

## تۆڵە

جووتیاری شەو نەخەوتوو! موژدە ئەمڕۆ باوتە
سەردەمی تیماری زامی جەرگی هەڵقرچاوتە
فەسڵی ئاواتی ژن و منداڵ و پیر و لاوتە
سواری ئەسبت بە و بڕۆ ئەمجارە نۆبەی راوتە
هەستە رۆژی تۆڵەیە، تۆڵەی دڵی برژاوتە

جووتیاری شەو نەخەوتوو! موژدە شەو نەیما ئەسەر
داری سیس و وشک و بێئاوی ژیانت هاتە دەر
خۆری ئیقباڵی بڵندت وا لە ئاسۆ هاتە دەر
شاخوداخ و بەردودارت بوو بە نیعمەت سەربەسەر
هەستە رۆژی تۆڵەیە، تۆڵەی دڵی برژاوتە

جووتیاری خۆشەویست! ئەی خاوەنی زێڕی وڵات
موژدە بێ ئیتر لە زنجیر و لە حەبست بوو نەجات
هەوری تاریکت رەوی، ئەستێرەکەی بەختت هەڵات
پشتی زۆردارت شکا، بوویە کوڕی گەورەی خەبات
هەستە رۆژی تۆڵەیە، تۆڵەی دڵی برژاوتە

جووتیاری خۆشەویست! ئەی مەنبەعی دین و یەقین
ئەی لە سایەی تۆوە عالەم، راحەت و ئازا لە ژین
موژدە بێ گیانە نەماوە دەورەیی شین و گرین
لێت موبارەک بێ برا! ئاوات و بەزم و پێکەنین
هەستە رۆژی تۆڵەیە، تۆڵەی دڵی برژاوتە

جووتیار! ئیتر ئەتۆ لەمڕۆکەوە خەمبار نی
بەندە و دیل و ئەسیر و نۆکەری زۆردار نی
دڵ بریندار و شەهیدی دوژمنی غەددار نی
سەد شوکر چی دیکە گیانە بێکەس و بێکار نی
هەستە رۆژی تۆڵەیە، تۆڵەی دڵی برژاوتە

جووتیار! ئیتر تەمی نەگبەت وڵاتت ناگرێ
کیژی سەر بێشکەت لە ترسی چاوی زاڵم نامرێ
خەنجەری خاوەن زەوی سینگ و زگت هەڵنادڕێ
قامکی نەرمی کوڕت ئەسرین لە چاوت ناسڕێ
هەستە رۆژی تۆڵەیە، تۆڵەی دڵی برژاوتە

رۆژنامەی کوردستان چاپی تاران، ساڵی ٤، ژمارە ٤٢ (١٩٦)، ١٩٦٣/٢/٢٠

ئەم پارچە شیعرەی نەمر مامۆستا نافیع مەزهەر (شپرزە) لە ژمارە ٣٣ی ساڵی ٤ (١٨٧) رۆژی ١٩٦٢/١٢/٢١ی رۆژنامەی کوردستان چاپی تاراندا بڵاو بۆتەوە و هاورێیە لەگەڵ چاپی شیعری "کوندەبوو"ی وەفا.
شیعرەکە بە وەفا پێشکەش کراوە.

## خوا بمپارێزێ

بۆ برای بەڕێزم "وەفا"

سپاست دەکەم وەفای باوەفام
دەک قەزات کەوێ لە پیاوی نەفام
نامەی نەخشینت بۆ منی یەنگی
نیشانەی لوتفە و دۆستی و یەکڕەنگی
مەعلوومە برا: کابرای سەقزی
ناگاتە ئێوە لە رێی نەبەزی
منیش وەک ئەڵێن زۆر ترسەنۆک نیم
لە قەزا و قەدەر نیمە باک و بیم
لە شێر ناترسم، ئەترسم لە کەر
کەر لە شێر زیاتر هەیەتی خەتەر
شەش مانگ تەوقیف بووم لەناو وشتران
خوا بمپارێزێ لە جووتەی کەران

## کۆچی شاعیری "سروودی پەڕەسێلکە"

ئەحمەد قازی

هەردەم کە تیشکی نیگام دەکەوتە سەر روخسارە رەزاسووکەکەی پەڕەسێلکەی بزەیەکم چاو پێدەکەوت کە بە سەر لێوەکانییەوە هێلانەی کردبوو. پەڕەسێلکەکان بە زستان کۆچ دەکەن و لە سەرە بەهارێکی زوودا دەگەڕێنەوە. بەڵام پەڕەسێلکەی بزەی سەر لێوی وەفا کۆچەر نەبوو، هێلانەی لە زەنویرێکی پڕ لە شیعر و چریکە و تریفەدا دانابوو، دڵی نەدەهات بەجێی بهێڵێت. ئەو بزەیە زۆر بە ئاسانی دەبوو بە خەندە و بۆ تەشقی قاقایەکی پڕ لە شادیش باڵی دەکێشا.

من وەفام بەو روخسارە نازدارە مرۆڤانەیەوە ناسی. یەکەم جار لە ساڵی ١٣٣٨ی هەتاویدا کە دەبێتە ١٩٥٩ی زایینی. پاش دەوامی ئیداری لە کتێبخانە چکۆلەکەیدا لە شەقامی سەرەکیی بۆکان لە نزیک حەوزە گەورە چاوم پێی کەوت. ئەودەم بۆکان شارەدێیەکی گەورە بوو بە دەوری قەڵاوە. قەڵای سەرداری بۆکان بەسەر حەوزەکە و شارەکە و دەشت و چیاکانی دەوروبەریدا دەڕوانی و خشت بە خشتی و لە درزی هەر دیوارێکەوە بە قەولی سوارەی نەمر:

*دەڵێی بورجی خاپووری مێژووی لە مێژین*

*لە درزی هەزار خشتی رۆژ و شەوانی*
*دڵۆپەی چپەی پۆلی پەریانی دادا*

ئەودەم قەڵا زۆر لە ئێستا قەڵاتر بوو. ئەمڕۆ کەوتۆتە گەمارۆی خانووبەرە و ساختومانی کۆنکرێت و پۆلا کە پێکەنینیان بە سستی و هەڵوەرینی کاگڵی سەر دیوارەکانی و داڕووخانی پایە و بناغەکانی دێت. خۆ خەڵکەکەش ئەوانە نین کە ئەودەم دەمدیتن، حەوزەکەش کە "لەبەر خۆرەتاوا وەکوو سینگی ژین دەهاژێ" وەک کیژە جوانەکانی ئەو هەرێمە مەقنەعەی ئاسنینی بە سەردا کێشراوە و ئیتر هەیهات کوان گۆزە بە شانە لەبار و نازدارەکان کە بە بەر دەرکی دووکانی وەفادا تێپەڕ بن و بە حیلک و هۆڕ و چاوەبڕکێ گۆزەکانیان لە ئاو پڕ بکەن و ساتێک راوەستن و دڵان بە تاڵان بەرنەوە ماڵان.

ئەو سێ چوار ساڵەی لەو بۆکانەی باسم کرد، جیرانەتی و خۆشەویستی و چێژی شیعر و رەزاخۆشیی وەفا هۆی حەسانەوە و خۆش رابواردنم بوون. کاتە خۆشەکان وەک برووسکە تیژ تێدەپەڕن. وا بوو من گەڕامەوە مەهاباد و لەوێوە سەری پڕشۆر رەتاندمی بۆ زیندانی قزڵقەلعە و قەسری تاران و پاش چوار ساڵ لەو دۆزەخانە هاتمە دەرەوە و لە تاران مامەوە. لە وەفا بێخەبەر بووم کە تەنیا دیوانە شیعرێکی "سروودی پەڕەسێلکە ـ سرود پرستو"م لێ دیبوو. ئەودەم کە پێکەوە بووین شیعرە فارسییەکانی بۆ دەخوێندمەوە و تاک و تەراش شیعری کوردی. ناسکترین زبان بۆ ناسکترین و خەیاڵبزوێنترین بابەتەکانی دەروونی شاعیرێکی بەسۆز دەکار دهاتبوون، رۆمانتیک بە تەواوی مەعنا. دیوانی "سرود پرستو" دەگەڵ

هەموو کتێبخانەکەم لە لایەن ساواکی شای ئێران بە تاڵان چوو. تەنیا ئەو شیعرەم لە بیر ماوە، لەبەر جوانیی بەیان و ناسکیی ڕێکەوەند و واژە و بەرزیی ناوەڕۆک بەم نووسینە تەمەنێکی درێژی پێ دەدەم.

*عزیز من نمی‌خواهی بدانی*
*که پل‌ها در قفای ما شکسته‌است*
*رهی گر هست پیش روست،زیرا*
*ره برگشت ما دیریست بسته‌است*

*(عەزیزی من! مەگەر نابێ بزانی،*
*کە پردی پشتی سەرمان پاک شکاون*
*ئەگەر ڕێگە هەبێت، ڕێی پێشوەچوونە،*
*لەمێژە ڕێی بەرەو دوا بەستراون)*

دەبینین کە ئەو ڕووناکبیرە چۆن پردەکانی پشت سەرمان دەشکێنێت و ڕێگەی گەڕانەوە و پاشگەز بوونەوەمان لێ دەبەستێت و تەنیا ڕێگەی چوونە پێشمان بۆ دەهێڵێتەوە!

وەفا بە شیعرە فارسییەکانی لە نێو شاعیرانی فارسی‌زباندا ناسرابوو. پاش سەرکەوتنی ئینقلابی ئێران و گەڕانەوە بۆ مەهاباد و پاشان دەست بە کار بوونم لە ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و بە دەستەوە گرتنی بەرپرسی و سەرنووسەری گۆواری "سروە" لە ورمێ، ڕۆژێکی کتوپڕ لێم وەژوور کەوت. پاش ٢٣ ساڵ ئامێزێکی دیکە پێکی گەیاندینەوە. هەمان عومەر، هەمان وەفا، هەمان ڕەزاسووک، بە هەمان پەڕەسێلکەی بزەوە! هێندێک ورگ‌زلتر لە

جاران. پێک شاد و شوکر بووینەوە و یەکەم پرسیارم ئەوە بوو: "دەگەڵ شیعرەکان بە کوێ گەیشتیت؟" وەڵامی دامەوە: "دەستم لێ هەڵنەگرتووە، جاروبار شتێک بۆ دڵی خۆم دەڵێم..." "دەجا بەشمان بدە، گۆوارەکەمان تینووی شیعرە پڕ لە خەیاڵە ناسکەکانتە..." "بە چاوان، با بزانم چۆن دەبێت..."
ئیتر دیسان هاموشۆ، دیسان هەمان... هەمان. زۆر جار دەچوومە نێو رێستوورانەکەی. ئەویش بۆخۆی هەر شیعرێک بوو، پاک و خاوێنی، تەعامی هەمەجۆرەی جیاواز و تازە. هەموو جارێکیش تا نەهارێک، شامێکی دەرخوارد نەدابایین دەستبەردار نەدەبوو. ئەوجار تاکوتەرا شیعری بۆ دەناردم و لاپەڕەکانی سروەم پێ دەخەملاند. ئەوجار هەموو بە کوردی بوو.

ئەم بیرەوەرییەم بۆ هەڵسەنگاندنی شیعرەکانی نەنووسیوە، چونکە هێشتا بەرهەمەکان سەرجەم لە دیوانێکدا کۆ نەبوونەتەوە تا بە پێداچوونەوەیەکی ورد و نووسینێکی تەسەل، سەیر و سەفەرێک لە دونیای شیعر و بۆچوونەکانیدا بکرێت. ئەوەندەی من لێرەدا دەتوانم بیڵێم ئەوانەن: وەفا شیعری دەگوت و لە شیعار بێزار بوو، زبانی شیعرەکانی وەک حەریری ناسک زەریف و بریقەدار بوو، جوانترین گوڵواژەکانی زبانی کوردی موکریان کە لە بۆکان و دەوروبەردا لە هەموو شتێک پاراوتر و خەملێوترە، بە هەودای ئاوریشمی خەیاڵی ناسک دەیهۆندەوە، تا لە خەیاڵ لێوڕێژ نەبا، تا ئیلهامی شیعرێک دەروونی نەهەژاندبا، شیعری نەدەگوت. بەڕاستی شیعر ئەوی دەگوت. هەر بەو هۆیەشەوە، شیعری کەم هەیە، بەڵام هەرچی هەیەتی شیعرە. وەفا بێگومان شاعیرێکی هەردەم ئەویندار بوو، لە

زۆربەی شـیعرەکانیدا بەرگـۆیەکی هەیە کە یـا نـاوی "عەزیـز"ی لـێ دەنێت یا نـاوی ناهێنێت. دەڵێی حەز ناکـا ئەو "ونبووە" بە کەسـێک بناسێنێت. شیعری وەفا بە زبانی فاخیر و ناوەرۆکی ناسک و لەباری پێکهاتەی کەلامییەوە دەچێتە خـانەی رۆمانسـییەتێکی نـوێ لە زبـانی کوردیدا.

ئەوەش نموونەیەک:

*شەوی وایە دەیان کەڕەت*
*خونچەی یادت لە بیرمدا*
*دەپشکوێ و*
*لق و پۆپی داری حەزم*
*گوڵ دەر دەکا*
*رۆژی وایە سەدان کەڕەت*
*پەنجەرەی دڵ دەکەمەوە و*
*بۆنی دەست و پەنجەت دەدزم*
*لەپی دەستم هەڵدەکەنم و*
*هێور هێور*
*چپە و سرتەی ئەوینی تۆی تێ دەڕژێنم*
*هەندێ جاریش تووڕەت دەکەم*
*لە خۆمەوە لە لام وایە*
*کاتێ نەختێ تووڕە دەبی،*
*پشکۆی گۆنات گەشتر دەبێ و*
*لە جارانیش جوانتر دەبی*

*چاوم پڕە لە مۆمی یاد*
*دەستم پڕە لە رەشبەڵەک*

ئـاخرین جـار کە چـاوم پێـی کەوتەوە، پەڕەسـێلکەی بـزەی سـەر لێوەکـانی کـۆچی نەکردبـوو، بەڵام دە هـێلانە داڕووخاوەکەیـدا پەلەقـاژەی مەرگـی بـوو. بەڵـێ خـاوەنی "سـروودی پەڕەسـێلکە" و بەرگۆی هەموو شیعرەکان، خەریکی کۆچێکی بێگەڕانەوە بوو.

مەخـابن! دنیـا لەگەڵ "وەفـا" بێوەفـا بـوو، بـێوادە کـۆچی پێکـرد و دیسان کۆستکەوتوو بووینەوە.

*سەرەتای زستانی ۱۳۸۴ ـ مەهاباد*[1]

---

[1] گۆڤاری مەڵبەند، لەندەن، ژمارە ۹٦، نەورۆزی ۲۰۰٦

## ؟؟؟

فەتاحی ئەمیری

*هەوری سەر سەران لەسەر سەری کردم کرێوەپێچ*
*بەرزی سەری بەفرگرە مەڕوانە سەرسەری*
*نەمدی سەری لە ئەرزی نەدابێ خولی زەمان*
*تێیدا بێ هەر سەرێ سەروسەودای سەروەری*

حەقیقی

زەنگی تەلەفۆن رایتڵەکاندم. دۆستی ئازیز و خۆشەویستم کاک رەحمانی محەمەدیان بوو، ئەو بوو بەڵام خۆی نەبوو، دەنگێکی مات، کز، کەساد و بێدەرەتان، بێئامان، دەستەوستان و بێسامان. دەنگی ئارام ئارام دەلەرزی، وەک باری گرانی غەم بە یەکجاری کۆڵی پێدا دابێ و بەژنی چەماوەی پشتی خەم کردبێ. وەک خاوەنی خەسارێکی بێگەڕانەوە، هێندی خاڵێکی چووک جێگای دڵدانەوەی هەرگیز نەمابێ. دەنگ نەبوو، غەم بوو، تەم بوو، ئاهەنگی دووری تەرسە دەهۆڵ، لە قووڵایی شۆرەکاتێکی بێگژ و گۆڵڕا، هەواڵی مەرگ و نەمانی لێدەباری.

هەواڵی لەنەکاوی مەرگی برادەرێکی خۆشەویست ئاخ چەند ناخۆشە، سەدان بیرەوەری، سەدان گاڵتە و قسەی خۆش، دە بڕوامدا ناگونجێ! جودایی سەختە، دووری لە وەفا بۆ هەمیشە، بۆ هەتا هەتایە غەدرێکی گەورەیە لە من. لێکهەڵبڕانێکی بەسامە و ماڵاواییەکی دڵتەزێن و گورچووبڕ.

دەگەڵ کاک رەحمان قەرارمان دانا، هاتە شوێنم و چووینە گۆڕستانی گەورەی شار. لە پەنا گڵکۆی مامۆستا حەقیقی جێگامان بۆ دۆزییەوە. جێگاکە جۆش بوو، قەبر هەڵقەن زەفەریان پێنەدەبرد وە شوێن ئەتڵەس کەوتین، ئێمە لە قەراغێک وێستابووین، کەوچکەکەی ئەتڵەس بە چرکە چرک و زۆرەملی نووکەکانی دەبرد دە دڵی خاکەوە هەر دەتوت بە خەساری دەزانێ دڵی گەرمی ئەو دە باوەشی ساردی بگرێ. ئاخ ئەم خاکە رووگەی لەمێژینەی وەفا بوو، کانگای ئەوین و دڵداری، جێپێی خەبات و فیداکاری، مەکۆی تێگەیشتن و پێگەیشتن، سەکۆی ماندوویی و حەسانەوەی.

من لە ساڵی ١٣٤٠ەوە وەفام ناسیوە، ئەوێ دەمێ سەرباز بوو، لە رادیۆ مەهاباد خزمەتی دەکرد، دەیانوت شاعیرە و دیوانی شیعری هەیە. ساڵی ٥٤ کە هاتمە شاری بۆکان، بووینە ئاشنا، پێش ئەوەی بە تەواوی دۆستایەتیمان گەرم بێ، من گیرام و تا ساڵی ٥٩ یەکترمان نەدیتەوە.

کاتێک چاوم دە نووکی کەوچکەکەی ئەتڵەس بڕیبوو، ژیانی وەفا وەک گلۆڵەیەکی کراوە بە مێشکدا هات:

خەیاڵ دەمبا، دەمبا، بە کووچە و کۆڵان و شەقامی شاردا بە پەنا چوارچرا و مزگەوتی سوور و پشت قەڵای شاری مەهاباددا، بە بەر مەحکەمەی قازی نەمردا، ئەوێ دەمێ من منداڵێکی کز و لاواز و چاوزەق بووم، لە مەدرەسەی سەرەتایی پەهلەوی ناونووس کرابووم بۆ هەوەڵی پاییز بچمە خوێندن. کۆدەتای شوومی ٢٨ی گەلاوێژی ٣٢ی هەتاوی. تێکشکانی جووڵانەوەی دوکتۆر موسەددیق و ئاشبەتاڵی بنەڕەتیی ئازادی لە ئێران.

ئەو ڕۆژەی سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسی، ئەو کاتەی باوک ئاوڕی لە سەر کوڕەکەی نەدەداوە، ئەو قۆناغەی پشووی ئازادی دە گەروودا خەفە دەکرا و دەنگی هەر چەشنە ڕەخنەیەک وسکووت دەبوو.

بۆ منی منداڵێکی لادێیی چاو نەکراوە دیمەنێکی بەسام و بەترس بوو. من ئەوانەم بۆ حەل نەدەبوو و بۆم هەزم نەدەکرا. چڵکاوخۆرەکانی ڕێژیم بە ئەوپەڕی سووکایەتییەوە خەڵکی شاریان ڕەپێچەک دەدا و لە ماڵی خۆیانڕا بە لێدان و کوتان بەرەو شارەبانییان دەبردن.

پێم سەیر بوو، ئەو لاوە کەسک و سوورانەی کەوتبوونە بەر پەلاماری پۆلیس، هەموویان لە من پاک و خاوێنتر بوون، چیان کردبوو؟ بەردیان بە کام گومبەزدا دابوو؟ سەری کێیان شکاندبوو؟ لە هەرکەسم دەپرسی، تەنیا لێم مۆڕ دەبۆوە، هەموو دەنگیان لێدەگۆڕیم. کەس بە هێندی نەدەگرتم و کەس ئاوڕی بەخێری نەدەدامەوە. دە ئاخریدا چوومە لای پیرە پیاوێک:

ـ مامە ئەوان چییان کردووە؟

سەرێکی لێڕاوەشاندم:

ـ ڕۆڵە بۆ بێدەنگ نابی، ئەوانە "موسەددیقی"ن.

تا دوایی بۆم ساغ نەبۆوە دەی موسەددیقی تاوانی چییە؟
دێتە بەرچاوم وەفا یەکێک لەو لاوە کەسکوسوورانە بوو، لە تەمەنی ژێر ١٨ساڵیدا بە تاوانی موسەددیقی بوون تووشی کۆت و زیندان و ئەشکەنجە هات. دەبێ لە بەرانبەر ئەو زەبروزەنگانەدا چۆن خۆی راگرتبێ؟ چۆن باشاری کردبن؟
پاشــی تەواو بــوونی بەنــدیخانە دەینێــرنە ســەربازخانە و دەیــکەنە سـەرباز، بە باشـی دێتەوە بەر چـاوم یەکـی لەقـی لاواز بـوو، هێنـدی گرەمێکی گۆشتی زیادی پێوە نەبوو، بە چاویلکەیەکی شووشـەییەوە و جووتێک پۆتینی بۆیە لێدراو.

چەنگاڵێ کەوچکەکەی ئەتڵەس هەروا بە خرتە خرت و چیڕەچیڕ دڵی جۆشی خـاک دەکوڵێ و گڵەکە دەخـاتە قەراغێک، ئارام، ئارام، خـاک تەسـلیمی مەکیـنە دەبـێ و بە نـابەدڵی باوەشـی بـۆ قەوارەی وەفـا نەختاڵێک دەکاتەوە.
ســاڵی ٤٢ و بەشــداری کــردن لە کێبەرکێــی شــیعر دەگەڵ بەشــی فارسیی رادیۆ دیهلی، سەفارەتی هیند و وەرگرتنی پەیکەرەی عاجی فیل لە دەستی دوکتۆر سەدیقی ئەعلەم وەزیری فەرهەنگی ئەودەم، رەنـگە ئەوکـاتە خۆشـترین کـاتی ژیـانی ئەم شـاعیرە لاوە بـووبێ و ئەوەی بیـری لـێ نەکـردبێتەوە رووخـان و تێکشـکان و نەمـان، داخـوا داهــاتوویەکی رەنگاوڕەنــگ چــۆن خەیــاڵی شــاعیرانەی داگرتبــێ و ئارەزووی لاوەتی چۆن مێشک و دەماری ئاخنیبێ.

دوو قەبر هەڵکەنی کز و پیر هەروا چاوەدێریی دەکەن. مەکینە هێدی هێـدی دەقـاڕێنێ، بەرە بەرە گڵکـۆ جـێ دەکـاتەوە، چـاڵێکی رەش بـۆ

دنیایەک ئاوات و هیوای سەوز. بانگێشت کردنی بۆ هیندوستان و پێشکێش کردنی ٥ جلد کتێبی جەواهر لەعل نیهرۆ. دیسان خۆشییە و دیسان ئەوپەڕی شایی بە خۆ بوون. ئینسانێکی شاعیر، ناسکخەیاڵ، نووسەر، رۆژنامەنووس، خەتخۆش و ئاشق دەبینی لە دوو دژایەتی، تاڵ و شیرین، سارد و گەرم، خۆشی و ناخۆشیدا، رۆژێک وەک پووش و پەڵاش دە گێژاوێکی بەسام و هیلاک دەکەوێ و کاتێک لە بەهارێکی سەرسەوز و جوان بە شنەبایەکی ئارام و بلاوێن چاوی خەواڵووی لە خەوی نازی بەربەیان هەڵدێنێ.

خرتەی چەنگاڵی ئەتڵەس هەروا بەردەوامە، ساڵی ٥٤ و ئاشنایی دەگەڵ وەفا و هاموشۆی دووکانی کەرەسەی ماڵ و جارجارەش جەفەنگ و گاڵتەم دێنەوە بیر، چی وای تێناچێ لێکهەڵبڕان و دووری. ساڵی ٥٩ و ٦٠ خۆ گردوکۆ کردنی بۆ سەفەرێکی ناچاری و هەرزان فرۆش کردنی ماڵ و دووکان و کەرەسەی دووکان، پاشان گوێزتنەوەی ماڵ و دووکان بۆ شاری ورمێ و لەوێشڕا پاش ماوەیەک بەرەو تاران. کڕینی دووکان لە مەیدانی شووشی تاران و دەست کردنەوە بە کاسبی و رۆژ لە نوێ و رۆزی لە نوێ.

ئەتڵەس پاشەکشەی کردووە. گاکۆرێکی فرەوان هەڵکەندراوە، دوو کرێکاری پیر و کز خەریکی دانانی گۆڕیچەن، بایەکی ساردی دێ و هەور دەگرمێنێ، بارانی بەجێماو لە سەفەری درێژی پاییز خەریکە ئانگژای سەر و گوێلاکمان بێ، غەم و تەم و تۆز و سەرما میوانمانن. دەڕۆمەوە ساڵی ٧٤، ئەو ساڵەی وەفا لە تارانەوە بەرەو بۆکان دەگەڕێتەوە، ئەو سەفەرەی کە بە پێ چوو بە سەر گەڕاوە، ئەو

سەفەرەی کە سەفەر نەبوو، دوور خرانەوە بوو. دە دونیای ئێمەدا کەس بە ئارەزوو نەژیاوە. دەچمەوە ئەو ساڵە و دەگەڵ وەفا خەریکی زەوی کڕین و هاتوچۆ و دانانی رەستووران و ماڵ و حاڵین.
بە بیرمدا دێ وەفا جگە لە شیعر و نەسر و رۆژنامەگەری و خەتخۆشی، جگە لە کار و خۆ بەخێو کردن، چەند شتی تازەشی بۆ هەوەڵ بار هێنا شاری بۆکان. دەسگای فۆتۆکۆپی، دەسگای ویشکشۆری و دەو ئاخرییەدا وەڕێخستنی رەستووورانێکی نموونە کە خواردەمەنی نوێی وەک پیتزای هەبوو، لە پەنای ئەودا خۆراکی سوننەتی کوردەواری سەنگەسیر.

باران دەباری، ئاسمانی شار لەمێژە فرمێسکەکانی بۆ رۆڵەیەکی بەنرخی خۆی راگرتووە، هەور هەروا دەگرمێنێ، ئاخر بێڵ وەسەر گڵکۆ دەکرێ.
دڵم پڕ بووە، هەرچی دەڕوانم شار بە چۆڵ دەبینم و گۆڕستان بە ئاوەدان، گۆڕستان وەفای تێدا و شار بێوەفایە.

برای بەڕێز تۆ بە ئاوات نەگەیشتی، رەنگە منیش نەیبینم، بەڵام رۆژێک دێ گژوگیای بەهاری بە وێنە گەلایەکی سەوزی زەیتوون سەر خاکەکەت داپۆشێ...[1]

[1] گۆڤاری مەڵبەند، لەندەن، ژمارە ٩٦، نەورۆزی ٢٠٠٦

## با بە نەریتی "وەفا" وەفادار بین

د. سەعید شەمس

بەڕێزان، ڕێگام بدەن خەم و پەژارەی خۆم بە بۆنەی کۆچی دوایی شاعیر و نووسەری کورد، کاک عومەر سوڵتانی "وەفا" دەرببڕم و لە لایەن ئەو کۆڕەوە هاوبەشی خەمی شاری بۆکان، کۆمەڵگای ئەدەبیی موکریان و کوردستان، بنەماڵەی سوڵتانی و بەتایبەت کاک ئەنوەری سوڵتانی بین.

مامۆستا هێمن لە پێشەکیی دیوانی تاریک و ڕووندا دەڵێت: "من بۆ خۆم وام، ڕەنگە زۆر کەسیش وابێ، کە شیعری شاعیرێک یا نووسراوەی نووسەرێک دەخوێنمەوە، چ زیندوو چ مردوو، پێم خۆشە خۆشی بناسم. بزانم کێیە؟ خەڵکی کام وڵاتە؟ کاری چییە؟ چۆن دەژی و ئەگەر مردووە، چۆن مردووە؟ لە کوێ نێژراوە؟ بۆیە بڕیارم دا سەرگوزشتەی خۆم لە سەرەتای ئەو بەشەی دیوانەکەمدا بنووسم... پێوە بووم زۆر درێژی بنووسم، تەماشام کرد دەبێتە چیرۆکێکی درێژ و شیرین و پڕ لە کارەسات. چ چیرۆکێک لە بەسەرهاتی ئینسانێک لە واقیع نیزیکترە؟ ئەویش بەسەرهاتی ئینسانێکی نیزیکەی پەنجاساڵی لە ساڵەکانی چەرخی بیستەم، ئەو

چەرخە پڕ لە کارەسات و پەلامارە، ئەو چەرخە پڕ لە ئاڵوگۆڕەی وەبیر بێ، بەتایبەتی ئەگەر ئەو ئینسانە کورد بێ."
هێمن بەو وتە جوان و پڕمانایەی ئاماژە بە کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز دەکات، کە مێشکی زۆربەی بیرمەندانی دوو سەدەی رابوردووی بە خۆوە سەرقاڵ کردبوو. لەراستیدا ئەوە قوتابخانەی ئەدەبی "سوررئالیزم" بوو کە ئەو گرفتەی، واتا دووفاقە بوون یان دووالیزمی بوونی رۆح و لەش، مادە و هۆش، ماتریالیزم و ئایدیالیزمی، نەک لە ناتەبایی، بەڵکوو لە یەکگرتوویی و پێوەندی یەکتردا پێناسە کرد.

لەسەر ئەو قسەیەی هێمن من دەخوازم لایەنێک لە ژیانی کاک وەفا باس بکەم. هەڵبەت کاک ئەنوەر بە وردی باسی ژیانی کاک وەفای کرد و من لێرە دەخوازم زۆرتر لەسەر ئەو جەخت بکەم.
کۆمەڵێک رووداو، کە لە واقیعدا روو دەدەن، دواجار دەبن بە خەیاڵ و ئەفسانە، و ئەفسانەگەلێک هەن کە بە شێوازی واقیعی سەر لەنوێ لە ژیاندا روو دەدەنەوە. بە واتایەکی تر، هیچ سنوورێک لە نێوان خەیاڵ و واقیع، داستان و ژیانی راستەقینەی مرۆڤ، دیاردە ماددی و فیکرییەکاندا نییە، کە شیاوی پەڕینەوە نەبێت، جوانی و راکێشەریی بیۆگرافیای کۆمەڵێک لە رووناکبیرانی کورد لە پەنجاساڵی رابردوودا، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە زۆر جار ئەو مانای دوولایەنی و دووبواریی ژیانە بە باشی وێنا دەکات. لە لایەکەوە زۆرتر بە رۆیا و خەیاڵ دەچێت و لە لایەکی ترەوە، دیاردەیەکی واقیعییە.

بۆ ئەوانەی، بەتایبەت بۆ نەوەی لاو، کە ڕەنگە تا ئێستا نێوی کاک وەفا ئەو شاعیرە نەریتشکێنە کوردەیان بە گوێ نەگەیشتبێت، دەبێت بڵێم کاک عومەر سوڵتانی "وەفا" لە ساڵی ١٣١٨ی هەتاوی لە بۆکان لە دایک بوو. کاری شاعیری بە چوارپارەی نیمایی لە پاییزی ساڵی ١٣٣٢ لە زینـدانی مهابـاد، یـانی کاتێـک کە لە دوای کودەتـای دژی خەڵکـی ٢٨ی گەلاوێـژی ١٣٣٢ بە دەسـتی حکـوومەتی نیزامـی بەختیـارەوە دەگیرێـت و دەکەوێـتە زینـدان، دەسـت پێدەکـات. بە واتایەکی تر، وەفا دوو ساڵ پێش خەرمانانی ١٣٢٠ کە لە دوای داگیر کردنی ئێران لە لایەن هێزەکانی هاوپەیمانەوە سەردەمی دیکتاتۆریی ڕەشی ڕەزاشا کۆتایی هات، لە دایک دەبێت. کاتێک کە کۆمەڵەی ژ.ک وەک یەکەم ڕێکخراوەی سیاسیـنەتەوایەتی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دادەمەزرێت، وەفا سێ ساڵان و کاتی بەرپابوونی حیزبی دیموکرات و کۆماری کوردستان، شەش ساڵان دەبێت.
لەو کـاتەوە تـا سـاڵی ١٣٣٢ کە وەفـا لە تەمەنـی ١٤ سـاڵیدا سـەر لە بەندیخانەی مهاباد دەردێنێت، گۆڕانکارییەکی زۆر قووڵ و بنەڕەتی بە سـەر بوارەکـانی سیاسـەت و ئەدەبـی کۆمەڵگـای ئێـران و کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا دیت. کە بێگومان شەقڵی خۆیان لەسەر ژیان و کارەکـانی دوایـی وەفـا دادەنـێن. هەر ئەوەی کە لە تەمەنـی ١٤ ساڵییەوە دەکەوێتە بەندیخانە، لە خۆیدا من لە زۆر وردەکاری بێنیاز دەکات.

تایبەتمەندیی ئەو قۆناغە سورریالیزمی بێوێنەیە دوو دامودەستگای سەڵتەنەت و ڕوحانییەت کە تەنیا دوو ناوەندی دەسەڵاتی ڕاستەقینە لە ئێرانی ئەو سەردەمە بوون، بە ڕاشکاوی نیشانیان دا کە کاتێ لە

ژێر گوشاری خەڵکدان و بێهێزن، پەنا بۆ هەموو شتێک دەبەن و حازرن لەگەڵ هەموو کەس سەودا و مامەڵە بکەن. بەس کاتێک هێز و توانایان هەیە بێڕەحمن، دەسووتێنن، کوشتار دەکەن و تەنیا بە ئامرازی تیرۆر و سەرکوت لەگەڵ خەڵک رووبەڕوو دەبنەوە. لە لایەکی ترەوە سوررریالیزمی ئەو سەردەمە، هەڵقوولاوی کۆمەڵگای بۆکانی و کوردستانی بوو کە وەفا تێیدا دەژیت. بێگومان بیرەوەریی رێورەسمی هەڵکردنی ئالای کوردستان کە لە سەربانی عیمارەتی قەلای بۆکان کە بە بەشداری نیزیک لە پێنج هەزار کەس لە رۆژی چوارشەممەی مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٥دا بەڕێوە چوو و لەو ئاهەنگەدا هەژاری شاعیری کۆماری کوردستان، حەقیقیی شاعیری ناسراوی شاری بۆکان، شیعریان خوێندەوە و هێمنی شاعیری میللی وەک ئەندامی هەیئەت و نوێنەری پێشەوا تێیدا بەشدار بوو، شەقڵێکی بەرچاوی لە مێشکی کاک وەفا بەجێهێشت. دواجار تێپەڕ بوونی ئەو سەردەمە کورت و زێڕینە، کاتێک وەفا لەنێوان کۆمەڵێک بەڵگە و بیرەوەری لە دوای جوابێک بۆ ئەو پرسیارە کە ئەوان کێ بوون، چییان دەویست و بۆ تەنانەت سیمبولی ئەو کەسایەتییانە ترس و وەحشەت دەخاتە ناو دڵی کاربەدەستانی ئێرانی، لەناکاو چاوی بە یەکەم ژمارەی گۆڤاری "نیشتمان"، ئۆرگانی کۆمەڵەی ژ.ک دەکەوێت کە چۆن باسی ئامانجەکانی کۆمەڵە دەکات:

*«کۆمەڵەی ژ.ک بە پێچەوانەی هەموو بەرهەڵست و قۆرت و چەڵەمەیەکی وەکوو دوژمنایەتی خۆبەخۆ، دووبەرەکی و خۆخۆری، پووڵپەرستی و بێگانەدۆستی کە لە رێگای پێشکەوتن و سەرکەوتنی کوردا هەیە بە هەموو هێز و توانی خۆی تێئەکۆشێت تا زنجیرە*

*کۆمەڵەی دیلی و ژێردەستی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد داماڵێ و لەم کوردستانە لەتوکوتەی ئێستا کوردستانێکی گەورە و رێکوپێک بێنێتە بەرهەم کە هەموو کوردێک بە سەربەستی تیا بژیت.»*[١]

کاتێک کاک وەفا منداڵێکی شەش ساڵە بوو قازی محەمەد کەسایەتییەکی ناسراو و دیاردەیەکی بەرچاو و هەستپێکراوی کۆمەڵگای کوردستان بوو، بەڵام کاتێک لە گۆشەی سارد و ترسناکی زینداندا هەستی ناسکی لە چوارچێوەی شیعردا وێنا دەکرد، پێشەوا بووبوو بە ئوستوورەیەکی زیندوو کە نە تەنیا ئیلهامبەخشی ژیانی وەفا بوو، بەڵکوو بووبووە هێمایەکی کورد و کوردایەتی و هیوای دوارۆژی کوردستان. بێشک ئەو وتەیەی هێمن کە دەڵێت:

*«ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە و ئەو کارەساتە جەرگبڕە هەموو کوردێکی بەشەڕەفی خەمناک و تازیەبار کرد. بەتایبەتی دڵی منی بە ناسۆر ئەنگاوت، ناسۆرێک کە بۆتە تیراوێ و ئێستاش هەر وەبن دەداتەوە و هەڵدەداتەوە و بێگومان سارێژ نابێ و لەگەڵم دێتە بن گڵ»*[٢]

بێگومان ئەو مێژووە و تەواوی ئەو کارەساتانە کە دواجار بوون بە ئەفسانە و ئوستوورە، کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر ڕەوتی ژیانی وەفا هەبوو، چونکە هیچ شتێک گیانسەختتر لە ئوستوورەیەک نییە کە خەڵک باوەڕیان پێی بێت. هەربۆیەش هەرچەند شیعری فارسیی وەفا زۆرتر ناوەرۆکی ئەویندارییان هەیە، بەڵام وەفا پتر لەگەڵ

[١] گۆڤاری نیشتمان، ژمارە ١، ساڵی ١، پووشپەڕی ١٣٢٢، ل١

[٢] هێمن، دیوانی هێمن موکریانی، پێشەکی و پێداچوونەوە س.چ. هێرش، ل٧٢

شاعیرانی شۆڕشگێڕی فارسی ئەودەم وەک سەعید سوڵتانپوور و نوسرەتی رەحمانی دۆستایەتی و تێکەڵاوی هەبووە و لە رێگای ئەو دۆستایەتییەوەیە کە چەمکی بۆکانی و کوردستانی لە ناو شیعری سوڵتانپوور جێی خۆیان دەکەنەوە.
محەممەدڕەزا شەفیعی کەدکەنی شاعیر ناسراو و مامۆستای ئەدەبی فارسی لەبارەی شیعری فارسی کاک وەفا دەڵێت:

*«وەفا شاعیرێکی بەتوانایە کە وەک شاعیرێکی غەیرە فارس پلە و جێگایەکی شکۆداری لە شیعری نوێی فارسیدا پڕ کردۆتەوە.»*

جێگای سەرنج ئەوەیە کە کاک وەفا لەپاڵ سوارەی ئیلخانیزادە، چاوە و حەسەنیانی وەک یەکەم شەپۆلی شاعیرانی نوێخواز لە رۆژهەڵاتی کوردستان دەناسرێن. شیعری وەفا هەرچەند بێبەری نییە لە کۆمەڵێک کەموکووڕی لە سەبک و فۆڕم، بەڵام جێپێیەکی بەرچاوی لەسەر ئەدەبی نوێخوازی رۆژهەڵاتی کوردستان هەبووە و هەیە. لە واقیعدا وەفا لە پاڵ ئەوانی تر، رچەی شکاند و قوتابخانەی شیعری نوێی لە ئەدەبی ناوچەی موکریانیدا ساز کرد و دەورێکی کاریگەری لەسەر پێشکەوتنی شیعری کوردی هەبوو. بەڵام لە هەمان کاتدا، ئەوان نەیانتوانی قوتابخانەیەکی تازەی ئەدەبی و شیعری لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا بخوڵقێنن. لە راستیدا بەرهەمی هونەریی ئەوان سەرەڕای دەوری رێخۆشکەری بۆ سەرهەڵدانی شێوازێکی نوێی شیعری لە رۆژهەڵاتی کوردستان، نەیتوانی نوێنەرایەتیی قوتابخانەیەکی ئەدەبیی نوێ بکات. هەربۆیەش هەرچەند ئەو نەوەیە لە شاعیرانی کورد زۆرتر لە شیعری نیمایی و دواجاریش شاملوویی

ئیلهامیـــان وەرگرتـــووە، بەڵام ئـــێمە لەو بەشـــەی کوردســـتاندا و لە دەیەکانی چل و پەنجادا، شاهیدی سەرهەڵدانی شۆڕشی نیمایی لە شیعری کوردیدا نەبووین.

هەڵـــبەت زەقکـــردنەوەی ئەو خـــاڵە، بە هـــیچ شـــێوازێک بە مانـــای داکێشانی ئاستی بەرزی شیعری ئەو شاعیرانە و بەتایبەت وەفا نییە. لە لایەکی ترەوە، رەنگە ئێستا رخنە گرتن لە کەموکووڕیی شیعری ئەو ســـەردەمە زۆر ســـووک و ســـانا بێـت، هەربـۆیەش مـن زۆر بە ئەسپاییەوە ئاماژە بەو نوکتەیە دەکەم. هۆی ئەوەش تەنیا شارەزایی کەمیی من لەمەڕ شیعر و ئەدەبی ساڵانی ٤٠ نییە، بەڵکوو هۆکارێکی مێژووییشی هەیە. لە راستیدا وەفا هەوەڵین کتێبی شیعری خۆی بە ناوی "سرود پرستو" لە ساڵی ١٣٤١دا بڵاو کردۆتەوە و ئێستا پاش چل ساڵ بێگومان دیتنەوەی کۆمەڵێک کەموکووڕی کارێکی دژوار نییە.
من تەنیا دەخوازم ئەوە بڵێین لە روانگەی کۆمەڵناسیی ئەدەبییەوە، تێکستەکانی ئەدەبی قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویی، هەڵقوڵاوی چوارچێوەی کات و شوێنی ئەو سەردەمەن. بیر و بۆچوونی شاعیر و نووســـــەر تێکەڵاوییەکـــــی بەرچـــــاوی لەگەڵ گوتارەکـــــانی ئەو ســـــــەردەمەدا هەیە و لە چوارچێـــــوەی تایبەتمەنـــــدییەکانی ئەو سەردەمەوە سەرهەڵدەدەن و پەرە دەستێنن. ئێمە ئێستا لە کۆتایی رەوتی رەخنە گرتن و پێدا چوونەوەی ئەو قۆناغەداین و گوتار و بنەمـــا فیکرییەکـــانی ئەو ســـەردەمە، چوارچێـــوە و شـــێواری بیـــر کردنەوەی ئەمڕۆ نییە. هەربۆیەش کاری رەخنە زۆر هاسان دەبێت.

بەڵام لە هەمـــان کاتـــدا تایبەتمەنـــدیی ئەو ســـەردەمە زۆر لایەن و گۆشەی نادیار دەخاتە بەردەمی باس و لێکۆڵینەوە.

وەفـا لە شـیعری نیمـایی ئیلهـامی گرتبـوو و بەو شـێواز و سـەبکە دەستی بە کاری شیعر گوتن کرد. نیما رەوایەتیی شیعری شۆڕشـی ئەدەبی بوو کە پێشتر سادقی هیدایەت لە پەخشـان و رۆمانـدا وێنـای کردبـوو. هیـدایەت بە بـاوەڕی زۆر کەس، ئەسـتێرەی گەشـەداری ئەدەبیاتی مۆدێرنی ئێرانە و لە راستیدا هیدایەت دەربیجەیەکی بەرەو مـۆدێرنیتە و دونیـای مـۆدێرن کـردەوە. هیـدایەت هەوڵـی دا "گیـانی پەرێشانی" ئێران لە رەوتێکی تـازەدا بـوێنێتەوە، قوتابخـانەی ئەدەبیی هیـدایەت هەم ناسـنامەی نەتەوایەتـی و شـوێنی خـۆیی بـوو و هەم پێـوەری جیهـانی و نێـونەتەوەیی. نیمـا بەردەوامیـی هیـدایەت بـوو لە شیعردا، بەڵام قوتابیانی نیما لە سـاڵانی چلدا رەوتێکی دیکەیـان گرتە بەر و یـا بە گـوتەی رەزا بەراهەنـی، نیمـا تـا ئەودەم گەورەتـرین شـاعیری ئێرانـی بـوو، بەڵام لە ناوەڕاسـتی چلەکانـدا، وەرچەرخـانێکی بەرچـاو لە رەوتـی ئەدەبـی کێشـدار (مەوزوون)ی ئێرانیـدا دەسـت پێ دەکات.

خـاڵی هەرە بەرچـاوی ئەو وەرچەرخـانە زۆرتـر گواسـتنەوە بـوو بـۆ چوارچێـوەیەکی فیکـری و ئایـدیۆلۆژیایی جیـاواز. گیـانی ئێرانـی لە کۆتـایی سـەدەی نـۆزدە بەولاوە، تەواوی دەسـتمایە کولتـووری، ئـابووری، کۆمەڵایەتی و رووناکبیریی خۆی وەگەڕ خست تـا لەشـی ئەو دێوە، واتا مودێرنیتە، بکاتە ناو شیشە و لە خولیای کۆمەڵگایەکی نوێ و دەوڵەتێکی هاوچەرخدا وێڵ بوو. بەڵام ئەو ئـارەزووانە هەر لە

سەرەتاوە لێڵ و ئاڵۆز بوون. دیالێکتیکی نەتەوەیی ـ جیهانی لە ساڵەکانی چلدا بەوپەڕی خۆی دەگات و ئەو ناتەباییە دەخاتە ئاستێکی جیاوازەوە. مۆدێڕنیتە لە لایەکەوە وەک دیاردەیەکی بێگانە، نامۆ و نەگونجاو سەیر دەکرێت ولە لایەکی ترەوە، ئەگەر قەرارە ئێران ئاسۆ و داهاتوویەکی روونی هەبێت، وەک دیاردەیەک سەیر دەکرا کە خۆپاراستن و دوور خستەنەوە مەحاڵ بوو. لەو روانگەوە، دیالێکتیکی نەتەوەیی ـ جیهانی سەر لەنوێ تەجزیە دەکرێتەوە و بە شێوازێکی نوێ دەڕێسرێتەوە و بە تیۆریی جیهانی و گوتاری نێونەتەوەیی بواری نەتەوەیی ـ مەڵبەندی زەق دەبێتەوە.
ئەو ناتەباییە بریتی بوو لە نەگونجاویی بیر و بۆچوونی ئێرانی لەگەڵ ناسنامەی فەرهەنگی جیهانی. گوتاری چلەکانی هەتاوی کە بووە هۆکاری گۆڕانکارییە فیکرییەکان، مۆدێڕنیتە وەک هەڕەشەیەک لە سەر ناسنامەی فەرهەنگیی ئێرانی هەڵدەسەنگێنێت. لە هەمان کاتدا، رووناکبیرانی ئێرانی بە گوتاری مۆدێڕنیتە رووبەڕووی ئەو هەڕەشەیە دەبنەوە. لە ئەنجامی ئەو ناکۆکی و رووبەڕوو بوونەوەیەدا، شێوازێکی فیکریی دوو جیهانبینی تەواو جیاواز و چەشنە ئامێتەیەک لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیای رووناکبیرانی ئێرانیدا سەرهەڵدەدات، کە بێگومان کاریگەرییەکی گەورەی لە سەر شیعر و ئەدەبی فارسی دەبێت.

شێوازی شیعری وەفا، کە لە سەرەتاوە زۆری لە شیعری نوێی فارسی ئیلهامی وەرگرتووە، بێگومان رەنگدانەوەی ئەو ئامێتەیەیە. هاوکات تایبەتمەندیی شیعری وەفا، زۆرتر لە شێوازی ناتورالیستی دەچێت: سروشت و ئەوین دوو بابەتی سەرەکی بوون لە کارەکانی

وەفادا، هەر بۆیەش لە دوای ١٣٤١ی هەتاوی بە شێوەیەکی سەرەکی هەر بە زمانی کوردی شیعر دەهۆنێتەوە. بە رای زۆربەی ئەو کەسانەی شارەزای شێوازی شیعری وەفان، هەرچەند وەفا لە شیعری کوردیشدا فۆرمی چوارپارەییی دەپارێزێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، ئەو فۆرمە ئامێتەییە تێکەڵاوی شیعری هیجایی و فۆلکلۆریی کوردی دەکات. دوای ئەو ساڵانەش، کاریگەریی شێوازی گۆران و شێرکۆ بێکەس لە کارەکانی وەفادا زۆر دیارە.

گواستنەوەی وەفا بۆشیعری کوردی، لە دایک بوونەوەیەکی دووبارە بوو، بەرهەمەکانی کوردیی وەفا کەمتر ئەو نەرمونۆڵی و ئامێتەییەی شیعرە فارسییەکانی پێوە دیارە. لە راستیدا، دوو رۆح و گیانی ئەدەبی، دوو وەفا لە یەک لەشدا، لە پاڵ یەکدا، هاوژیانیان هەیە. جارجار دۆست، جارجار رەقیب، بێشک ئەوە تەنیا سوریالیزمی ژیانی وەفا نییە، بەڵکوو تایبەتمەندیی هەلومەرجی کوردی رۆژهەڵاتە.

سەرئەنجام دڵی گەورەی وەفا لە رۆژی سێشەممەی یەکەمی خەزەڵوەری ١٣٨٤ی هەتاویدا لە لێدان کەوت و ئەو ئینسانە بەهەست و ئاشقە، پاش ٦٦ ساڵ ژیان، خەبات و ئافراندنی چەندین بەرهەمی گەورەی ئەدەبی، ماڵئاوایی لە ئێمە کرد و لە شاری بۆکان لە پاڵ حەقیقی، شاعیری ناوداری بۆکان و موکریان، تەسلیم بە خاک کرا.

وەفا پێش هەموو شتێک، مرۆڤێکی ئازادە و سەربەست بوو. بۆ من کە شانازیی ئاشنایی و دەرفەتی فێر بوون لە مامۆستا وەفام لە ساڵانی دوایی و لە هەندەراندا بۆ رەخسا، تەوازوع و عیززەتی

نەفسی ئەو مرۆڤە کاریگەرییەکی گەورەیان لە سەر من دانا. تەنانەت بەو تێـڕوانینە سـەرپێییەش کە مـن لەمەڕ هەلـومەرجی مێژوویـی سـەرهەڵدانی شـیعری وەفـام کـرد، دەبینـین کە مێـژووی ژیـانی وەفـا دەکەوێتە نـاو تونـد و تیژتـرین قۆنـاغی ململانێی سیاسـی و ئەدەبیی ئێران و رۆژهەڵاتی کوردستان، گۆڕەپانی زۆرانبازیی سیاسی بوو لە پێناو بەدیهێنانی سەربەستی و رزگاریی نەتەوەیی.

لە بارودۆخی رۆژهەڵاتی کوردستان و لە دوای *شۆڕشی ئیسلامی* و سیاسـەتی داپڵۆسـێنەرانەی کۆمـاری ئیسـلامی لە دژی گەلـی کـورد، هەلـومەرجێکی دژوار بە سـەر هەمـوو گەلـی کـورد و کـاک وەفـای شـاعیردا سـەپا. لەپـاڵ ئەوەشـدا گـوزەری عـومر، پیـری، نەخۆشـی و تەنگوچەڵەمەی ژیان و بەڕێچوون، هەردەم مەیدان و بواریان بۆ ئەم شـاعیرە بەرتەسـکتر دەکـردەوە، بەڵام کـاک وەفـای ئینساندۆسـت، شـاعیر و هەستناسـک، کۆڵی نەدا و تـا دوایین کـاتی ژیـانی لە دژی تاریکی، خەبات و تێکۆشانی کرد. لە روانگەی منەوە لە پاڵ هەستی جوانی وەفا بۆ سروشت و ئەوین، بەرزترین سوننەتی وەفا، عیززەتی نەفسی ئەو بوو.

لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، دیاردەی رووناکبیری حیزبی بوو بە شـێوازی زاڵـی کۆمەڵگـای کـوردی و گەیشـتە ئاسـتێکی بێسـنوور، هەربـۆیەش وەفـا و هەڤـاڵانی وەفـا لە بیـر چـوونەوە. وەفـا کە وەک شاعیرێکی بلیمەت لە ساڵی ١٣٤١ی هەتاویدا یەکەم دیوانی شیعری لە چـاپ دابـوو، لە ژێـر قیلوقـاوی روونـاکبیرانی حیزبـی نێـوێکی لە نێواندا نەمـا. بەڵام ئەو بـارودۆخە هەرگیز نەیتوانی تەنگ بە وەفـای

کـۆڵنەدەر هەڵچنێـت. وەفـا لەو هەلـومەرجە نائاساییەشـدا بەردەوام خەریکـی کـاری ئەدەبـی، رووناکبیری و زینـدوو کـردنەوە و وەگەڕ خستنی یەکتێیی نووسەرانی کورد و کۆمەڵگای مەدەنی بوو.

لە بارودۆخی ئێستای کوردستان بە گشتی و رۆژهەڵاتی کوردستان بەتایبەتی، گەلی کورد هەلومەرجێکی لەبارتری بۆ خەبات لە پێناو رزگاریی نەتەوەییدا بۆ رەخساوە. ئەمرۆ وەفاداری بە نەریت و سوننەتی وەفا لە هەموو کات پێویستترە. لەو بارودۆخەدا لە ژێر گۆڕانکاریی بێ‌وێنەی میدیایی و سەرهەڵدانی شێوازێکی نوێی پێوەندی و کامیۆنیکەیشن، هەردەم سنووری رۆشنگەری و رابواردن (enteraimment) کەم رەنگتر دەبێت و لە ژێر کاریگەریی ئەو پەرەسەندنەدا، جیاوازی نێوان رووناکبیر و شەومەن نادیارتر دەبێت، ئێمە پتر لە هەموو کاتێک پێویستیمان بە زیندوو راگرتنی سوننەتی وەفایە.

لەندەن[1]، ۲۰۰۵/۱۲/۳

[1] گۆڤاری مەڵبەند، لەندەن، ژمارە ۹٦، نەورۆزی ۲۰۰٦

## بۆ کاک بارام فەڕشی و "ناخۆش خەوەرێ"!

حەسەن ئەیوبزادە

پرسیبووت ئاخۆ وەفای شاعیرم لە بیرە؟
بەڵێ لە بیرمە. بەڵام نەتپرسیبوو وەفای کام سەردەم؟ کامە وەفا؟ ئەو وەفا شاعیرە گەنجە بۆکانییە کە خەڵاتی ناسکخەیاڵیی لاوانی سەردەمی خۆی لە وڵاتی هیندی چەند سەت ملیۆنی بۆ ناردرا؟ ئەگەر ئەو وەفایەت مەبەست بێ، بەڵێ لە بیرمە.

زانایەک گوتی: تەمەن ئاوی چۆمە، دێ و دەڕوا. بەڵێ تەمەنی لاویی وەفا و مێرمنداڵی خۆمم لە یادە. بیری منداڵی تیژە، لە ٤٣ ساڵ لەمەوبەرەوە بەرەو سەردەمی منداڵیی خۆم دەگەڕێمەوە. برا زیتەڵە، قسە خۆشە، خۆش مەشرەفەکەی، هاوتەمەن و هاوپۆل و هاوگەڕەک و هاوڕێم بوو. ماڵەکەیان لە گەڕەکی حەمامی کۆن بەرەو ئاشی خانم لە تەنیشتی ماڵی مامۆستا شێخ حەسەنی کازمیی بوو. دوو ماڵ بە تەنیشتی یەکترەوە، یەکیان ماڵێکی گەورەی پڕ لە هەرا و هاتوچۆی ورد و درشت رووگرژ، منداڵ چاو بە فرمێسک و گەورە پیاوی غەزریو و دەستوەشێن و بەسام کە من لێیان دەترسام.

حەوشەکەی ئەو ماڵە چەشنی گۆڕستانێک بوو بە تاتەبەردی درێژ و کانیاوێ لە ئاو و قەوزە تەژی و چەند شۆڕەبی کە قوتابییەکانی مامۆستا شێخ حەسەن کازمی لە ئێوارانی هاوینەوەرزدا لە بنیان ڕۆدەنیشتن و بە دەنگی بەرز ئەلف‌وبێیان هاوار دەکرد.
یەکەم جار لەبەردەمی ئەو ماڵە گوێم لە وتەی پیاوێک بوو کە دەستی منداڵەکەی بە دەستەوە و بە زۆر لە دەرکەی کراوەی ماڵی مامۆستای دەپەستاوت و دەیگوت: «پێم گوتووە گۆشتەکەت هی ئەوە و ئێسکی جەندەکت هی من.» کوڕیژگەش هاواری دەکرد: «باوکە! لێم‌گەڕێ با نەچم، وانەکەم نەنووسیوە، لێی دەترسم، لێم‌دەدا، ناچم.» ئەو کاتە دڵم کەوتە لەرزین، زۆر جار مامۆستا لە قوتابخانەی قەڵای سەردار، کە لەوێ "نازم" بوو، بە قامچییەکەی سەروگوێلاکی تێک‌کردبوومەوە... کاتێ کە باوکی کوڕیژگە بە تووڕەییەوە گوتی: بە مامۆستام گوتووە گۆشتەکەت بۆ ئەو و ئێسکەکەت بۆ منە، دڵم داخوڕپا. هاواری کوڕیژگەکەم لە ژێر قامچی مامۆستادا بیست، وەکوو ژێی کەوان وێک‌هاتم و چەشنی دارێک بە پێوە رووخام. لەو ڕۆژەوە لەو ماڵە و لە دەرگاکەی و لە گمەگمی کۆتری سەربان و تەنانەت جریوە جریوی چۆلەکەی بن گوێسوانەی ماڵەکەی مامۆستا و لە قەڵافەتی بەخۆف و زەبەلاحی دەترسام. ئێستاش کە بیر لە مامۆستا و قامچییەکەی دەکەمەوە، بە خۆم نییە وەکوو مەڵێکی باشوو لێ‌دراو هەراسان بۆ حەشارگەیەک دەگەڕێم خۆی تێ‌پەستێوم.

بەڵام بۆنی گوڵی یاسەمەنی ماڵەکەی تەنیشتی ماڵی شێخ حەسەن، خەوی پشیلە بەڵەک و بێچووەکانی لە بن سێبەری دارە یاسەمەن و

لە داوێنی دوو سێ دێراو سووسەمبەر و رەشەڕێحانە و زۆربڵەیی پۆلێک چۆلەکە کە خۆیان بۆ شەڕە دەندووکێی پۆلێکی دیکە ئامادە دەکرد وەکوو گوڵمێخ لە بەردەمی دەرگاکە دایاندەکوتام.

ئەو پاژە، ماڵی میرزا عەبدوڵڵای خەیات، میرزا عەبدوڵڵای سوڵتانی بۆکانی بوو. دوو داری یاسەمەنی ئەو ماڵە کە سروشت پێی ئەسپاردبوون بۆنی خۆشیان بە هەوادا بڕەتێنن، منێ خولیای بۆنی خۆش و جیهانی سرت و خورتی پاساری و سەیری خۆشەویستیی پشیلە و بێچووەکانی و دیداری کوڕە گچکەی برادەر و هاقاڵم لەو ماڵە، بەرەو ئەو کۆڵانە کە سەرەڕێی هەمووان بۆ بازاڕ و حەوزە گەورە بوو رکێش دەکرد.

لە نێو خەڵکدا باو بوو، منیش بیستبووم و دەگوترا: میرزا عەولای خەیات، باوی قورئان لە سنگی وەفا و ئەنوەر، بە ئاوی ئەوینی نیشتمان و بۆنی گوڵە یاسەمەنی حەوشەکەی خۆی، دەستنوێژ هەڵدەگرێ. لە ساڵانی دووری لە وڵات، لە زمانی ئەنوەری توێژەر و زانای ئەدەب و مێژوو، بیستم کە میرزا عەبدوڵڵا بە بیستنی شیعرەکەی حەیدەر بابای شەهریار وەکوو مەولەوی تاوەگۆزی بە خوێندنەوەی نامەی شێخەکەی جەزمە گرتوویە، فرمێسکەکنی بە گۆنایدا شۆڕ بۆتەوە و بووە بە شەمێکی داگیرساو و نەرم نەرم تواوەتەوە. ئەو کاتەم لەبیرە کە بە روخسارێکی مات و زەردەخەنەیەکی کاڵ و خەمێکی هەڵکورماو لە چاویدا بەلەز بە کۆڵانەکەدا بەرەو شەقام و دووکانەی تێدەپەڕی.

وەفای شاعیر، کاکە ئەنوەری ئەوکات و شاعیرو نووسەر و مێژووناسی ئەمڕۆ و دوو خوشکەلێی ئەو دوو برایە، بەرهەمی ژیانی ئامینەخان (ئاخر وشەی هەر دوعا و هاوار و نیاز و پاڕانەوەیەک لە

خوا) و میرزا عەبدوڵلای بەهەست و پاکڕەوشت لەو ماڵە بچووکەدا خەملی. ئەو ماڵە پیرۆزە، یەکەم قوتابخانەی ژینی چوار زارۆک بوو کە بە تریفەی ئەوین تەنرابوو.

وەفای شاعیر لە خەیاڵخانەی خۆیدا لەگەڵ پەپوولە و پەڕەسێلکە، کیژە بۆکانی، گلۆک و کانیاوان ژیا تا باری گرانی ژین، پشتی چەماند و ناچار ما جیهانی هورم، ڕەنگ و تیشک بەجێ بێڵێ. بەڵێ ناچار بوو لە جیهانی پەپوولە و پەڕەسێلکە، تریفە، بۆنی یاسەمەن و باران ڕوو وەرگێڕێ و نابەڵەد و ناشارەزا لە خوارەکە و پێچەکە و گەڕ و فێڵی شەڕی بێبڕانەوەی شەڕگەی بازرگانان بخزێ. لەو شەڕگەیەدا بۆ وەفا جێیەک بۆ پاراو کردنی گوڵە گەنم و هەڵمژینی بۆنی مێخەک و بیستنی قاسپەی کەو و بەسەرهاتی زینومەم نەبوو. لەو مەیدانەدا تا چاو هەتەر دەکا تەلبەند و قەڵغان و شمشیر و کەلاکی تازەی شەرکەرانی پەککەوتە و ماندووی وڕێنەکەری تێشکاوی ڕوو لە ڕۆژاوایە کە وەنەوز دەدەن، مچووڕک لە لەشیاندا هەڵکورماوە و بۆ بڕووکە هێز و هەستانێکی دیکە دەکڕووزێنەوە. پەپوولە و پەڕەسێلکە مەگەر لە تاریکایی شەودا بە ئاسمانی ئەو مەیدانەدا بفڕن،

ئێرە جێی وەفا نەبوو. هەموو ڕۆژێ لێرە کارەسات نوێ دەبێتەوە. وەفاش وەکوو هەموو دەست و دڵپاکان لەو شەڕگەیەدا نە توانای شەڕی بوو نە زمانی ئەو بازاڕەی دەزانی هەر بۆیە تێشکا. وەفا لێرە بیانی بوو. وڵاتی بیر و هۆش و هەستی داگیر کرابوو. لێرە کولێرە شەکریی شیعرەکانی کڕیاری نەبوو. شیعرەکانی ئەو بە زمانێک نووسرابوون کە بازاڕچییەکان تێینەدەگەیشتن. وەفا لەو

گرتووخـانەیەدا مـایەوە و هەسـتی ناسـک و خەیـاڵی بەرزەفـڕی لە ڕکەی سنگیدا هەڵپڕووکا. وەفا لە ئاخر ساڵەکانی ژینیدا وەکوو خۆم بە ئـازاری دڵـی بە کـوڵییەوە گرفتـار بـوو. لە هەمـوو سـاڵەکانی دەربەدەری چـاوەڕوانی گەڕانەوەی وەفـا بـۆ جیهـانی شـیعرە تەڕ و ناسکەکانی و سکاڵای دڵ و گۆرانی دیمەنـی ناڵەشـکێنە و گـومبەزی سـەردار و ئـاوی خوڕێنـک و هەڵاڵە بـرایمەی شـاخانی بـووم. ئێسـتا گـڕی شـەمی وجـوودی بە بـای پـاییز دامرکـاوە. بەڵام کـێ دەڵـێ لە سـەرەبەهاردا نـابێتە گـوڵە گەزیـزە و لە داوێنـی ناڵەشـکێنە سـەر هەڵنـاداتەوە یـان لەگەڵ بۆنی گوڵی یاسـەمەن و جریـوەی چۆلەکە و گمەگمـی کـۆتری گوێسـوانەی مامۆسـتا شـێخ حەسـەنی ڕەحمەتـی و ئـاوی خـوڕێنکی حەوزە گەورە بەرەو مـاڵە قـوڕینەکەی سـەردەمی منداڵیی ئەنوەر ناگەڕێتەوە؟

هولەند، ٢٧/١١/٢٠٠٥

www.bokan.de ماڵپەڕی

# "وەفا" لەم وڵاتە کۆچی کرد

محەمەد سەعید نەجاڕی "ئاسۆ"

پـــــاییزە، وەرزی زەردی و هەڵـــــوەرینە، وەرزی گەڕانەوەی مەلە کۆچەرەکان بۆ گەرمێن، وەرزی باڕشتی سروشتە، وەرزی سـەرما و شـــەختە و بـــادەوەیە. دەورە دەورەی بـــای زریـــانە، شـــەماڵ خـــۆی شـــاردۆتەوە و تـــا بەهـــاری داهـــاتوو لەگەڵ گەڕانەوەی دووبـــارەی مەلەکـان خـۆی دەرناخـات. ئـا لەم وەرزە تـووش و تـاڵەدا، لەم وڵاتە بێخاوەنمـاڵەدا، "وەفـا" بـۆ هەمیشـە چـاوی لێکنـا، تـا ئیـدی پتـر ئەم وەرزە تـووش و تـاڵە بە چـاو نەبینێت و دڵە ناسـکەکەی پتـر برینـدار نەبێـــت، بەڵام بـــۆ یـــارانی باوەفـــای "وەفـــا" هەر ئەم پرســـیارەی بەجێهێشـــت کە ســـاڵەهایە فارســـان دەیڵـــێن: "خوبـــان چە بیصـــدا میمیرند" (مێرخاسان چ بێدەنگ دەمرن!)

بەڵێ کـاک عومەری سـوڵتانی "وەفا" شـاعیری نوێخوازی بۆکـانی کە سـەرەتا بە کتێبی شیعری فارسی "سـرود پرسـتو" خـۆی بە خوێنەری شیعرەکانی ناساند و بە خوو و ڕەوشتی شاعیرانەی و ژیانی سەراپا داهێـنەرانەی تەواوی خەڵکـی بۆکـان و نـاوچەی دەگەڵ خـۆی کـردە ئاشنا، رۆیی.

"وەفـا" ئاشـنای هەمـوو ئینسـانێ بـوو. وەفـا شـاعیر بـوو، وەفـا عاشـق بـوو، وەفـا کـورد بـوو، وەفـا ئـاگرێکی لە دەروون هەمیشـە دایسـا کە

جـگە لە یـارانی باوەفـای کەس هەسـتی پێنەکـرد. ئـاگری خەمـی کۆیلەتیی گەلەکەی، ئاگری ناتەبایی و نابەرابەریی ئینسانەکان، ئاگری لە یەک نەگەیشتنی رۆشنبیرەکان. هەر ئەو ئاگرە بوو شیعری ئاوای بە دڵدا دەهێنا:

*شعر من چیست؟ سایه ابهام*
*شعر من چیست؟ شعله عصیان*
*شعر من چیست؟ شیره اندوه*
*شعر من چیست؟ یورش طوفان*

*(شیعری من چییە؟ سێبەری گومان*
*شیعری من چییە؟ بڵێسەی راسان*
*شیعری من چییە؟ شیلەی خەم و داخ*
*شیعری من چییە؟ هێرشی تۆفان)*

تەماشا کەن لەم چوار وشـەی کلیدی "ابهام" و "عصیان" و "اندوه" و "طوفـان"ە دیـارە ئەوەنـدەی فارسـەکان ئەم وشـانەیان بەکـار هێنـاوە، کـوردانیش پتـر دەگەڵیـان ژیـاون، هەربـۆیەش شـاعیرێکی کـورد بە هەسـتێکی چینـایەتییەوە بە فارسـی دەیانکـاتە کەرەسـتەی دەربڕینـی هەسـتێکی ئـاگراوی و بـۆ "ابهـام" واتە سەرسـامی و خەیـاڵاوی بـوون بینەر دەخوڵقێنێت و بۆ "عصیان" واتە راسان شوعلە دەئافرێنێت و بۆ "انــدوه" واتە کەســـەر و غەم شـــیلە و عوســـارە دەکوڵێنێــت و بــۆ "طوفان"یش هێرش هەڵدەستێنێت.

بەڵام ئەو چ بکـا، ئەو هەرچــی گــاز دەکـا لە خــوێنەرانی، جوابێـک نابیستێت، ناعیلاج لە هەڵبەستی "سکوت تلخ" (بێدەنگی تاڵ)دا ئاوای خۆی رازی دەکا:

*روزگاری رفت و ما تنهای تنها ماندەایم*
*بی‌کس و کاشانە چون بومی بە صحرا ماندەایم*
*درمیان موجهای سرکش طوفان عمر*
*قایق بی‌ناخدائیم و بە دریا ماندەایم*

*(رۆژگارێک رۆی و وا ئێمە بە تەنیا ماینەوە*
*بێکەس و بێ‌لانە، وەک کوندێک لە سەحرا ماینەوە*
*راست لە نێو مەوج و شەپۆلی توندی تۆفانی تەمەن*
*بووینە پاپۆڕ و بە بێ خاوەن، لە دەریا ماینەوە)*

کە لێرانەشدا وشەگەلی وەک "تەنیا" و "بێکەس" و "کوند" و "سەحرا" و "شــەپۆل" و "تۆفــان" و پــاپۆڕی بێ‌پــاپۆڕەوانی نێــو بەحــر دەبــنە دەستەچیلەی ئاگرە شیعرەکەی و خەمە گەورەکەی وەدەر دەخەن و شاعیر بێکەس و تەنیا، وەک کۆتەی سەر ئاو لەسەر شەپۆلی دەریای دوورە دەستی ئاواتەکانی ئاوا دەناڵێت:

*آه از آغاز هستی تا بە انجام وجود*
*در فریب وعدە امروز و فردا ماندەایم*

*(هەر لە دەسپێکی ژیان تاکوو سەرئەنجامی وجود*

*هەر فریوخواردووی بەڵێنی دوێکە. سۆزیماینەوە)*

ئەمە هاواری ٤٩ ساڵ لەمەوبەری ئەو شاعیرەیە، ئەو کاتە کە من ٣ ساڵم تەمەن بوو، کاتێ کە ساڵی ١٣٦٧ واتە پاش سی ساڵ لە تەمەنی شاعیریی ئەو شاعیرە تێپەڕ دەبوو وەک دوو شاعیری بۆکانی پێکەوە دانیشتین، جگە لەوەی وەفا بوبووە پایتەختنشین و لە باری ژیانی دونیایی هیچی کەم نەبوو، کاتێ باسی دەردەکانی نێو شیعرەکانی دەهاتە ئاراوە هەر لەم فریوی وادەی ئەمڕۆ و سبەینێ دڵ پڕ بوو، ئەمجار بە کوردیش دەینالاند، نالەی شاعیرێکی دوورە وەتەنیش، دوور لە کوێستانی کوردەواری، دوور لە بۆکان و حەوزە گەورە، دوور لە چیای نالەشکێنە. بەڵام هەر بە یادی وڵات و ئاوازەکانی حەسەن زیرەک شیعری دەگوت و چاوەڕێی دوارۆژی روونـاکی گەلەکەی بوو. جا بۆیە "شەوبۆ"ی دەکردە رەمزی ئەوینەکەی و وەفای خەتخۆش و شاعیر ئاوای دەهۆندەوە:

*لە دووری تۆ، دڵم شێواوە شەوبۆ!*
*بە بێ ئاگر، لەشم برژاوە شەوبۆ!*
*لەوێ ڕۆژێوە دیمی بۆ هەوەڵ جار*
*نە ئیمانم نە دینم ماوە، شەوبۆ!*

بەڵێ ئەم دڵە ئازیزە ئەم دەنگە شیعرییە رەسەنەی فارسی و کوردی، ئەم ئاشنای هەموو دەرد و ئاشناییە لە نێوماندا رۆیی و حەقمە بڵێم بە رۆینی ئەو، "وەفا"ش لەم وڵاتە کۆچی کرد، چونکە ئەو نموونەی

وەفاداری بوو و چوو لە مەرگیشدا لە پەنای مامۆستای گەورەی شیعری موکریان، مامۆستا حەقیقیدا خاک لە ئامێزیان بگرێت.

ئەو خۆشەویستە لە ڕێکەوتی ١٣٧٣/٥/١٧ (١٩٩٤/٨/٨)دا نامەیەکی ڕازاوەی لە تارانەوە بۆ من ناردبوو کە دوو شیعری تێدا بوو، پێم حەیف بوو نەیخەمە بەر چاوی خوێنەرانی خۆشەویستی ئەم گۆڤارە گرانسەنگە، کە یەکەم دوو بەیتی بەم جۆرەیە:

*بە بۆنەی تۆوە بۆنی دێ هەڵاڵە*
*بە بۆنی تۆوە بۆنخۆشە گوڵاڵە*
*بە بۆنی تۆوەیە شەیدایە نێرگز*
*بە بێ تۆ بۆن و بوونی گوڵ بەتاڵە*

کە هەر ئەم دوو بەیتە بەسە کلاسی شیعری و ڕادەی هەستی پاکی لە شیعردا وەزندار بخاتە ڕوو، ئەوا لە دوایین بەشی نووسراوەکەمدا شیعرەکەی دیکەشی کە بۆ منی ناردبوو و پێموایە لە هیچ کوێی دیکەدا نیەتی، بە خەتی خۆی بۆتان دەنێرم هیوادارم جێی ڕەزامەندی ئێوەی ئازیز پێک بێنێت.
هەروەک دیارە شیعرەکەی پێشکەشی بە ئەحمەدی شاملوو کردووە.
ئیدی هەموو لایەک بە خودا دەسپێرم

(٢٠٠٥/١١/٢٦) ١٣٨٤/٩/٥

*بە بۆنەی تۆوە بۆنی دێ هەڵاڵە*
*بە بۆنی تۆوە بۆنخۆشە گوڵاڵە*
*بە بۆنی تۆوەیە شەیدایە نێرگز*

*بە بێ تۆ بۆن و بوونی گوڵ بەتاڵە*

*سەعید گیان*

*نامە جوانەکەت وەک ئاوی گۆزەیەکی سووری سارد توونیەتی شکاندم بریا منیش وەک تۆ بەسەر وشە و واژەی کوردیدا زاڵ بوایەم و بمتوانیایە ئەوەی لە دڵمدایە قەڵەمەکەم بینووسێ و "هەڵبەت نەشترسایەم" بەڵام کوێر بم، چ نازانم و چم بۆ وەسەر یەک ناخرێ. شیعرە جوانەکانیشم هەر کامە دوو سێ جار خوێندەوە پەککوو شیعرەکانت چەند ڕێکوپێکن ئاسۆ! یا ڕەببی لە چاوی بەد بەدوور بێ و قەڵەمەکەت هەر وا غەڕڕا بێ. شیعری "چاوەڕێ" لەوپەڕی جونیدا بوو، ڕازاوە و تازە بوو بەڵام "پارکی نامۆ" شتێکی دی وەدەر دەخست، شاکار بوو، شاکارێکی تایبەتی، دەیان وشەی پڕ لە هەست لە بێشکەی "پارکی نامۆ"دا جۆلانەیان دەکرد. پارکی نامۆ لەبەر دڵی من کەژاوەی ڕۆژ بوو، باڵەفڕەی خەو بوو، ئەسپی هەتاو و گۆمی چاو بوو، دەنگی باز و زنەی ئاواز بوو، بانیژەی دەست و لوتکەی هەست بوو، باخچەی دڵ و شەقامی گوڵ بوو، مەکۆی تین بوو، ئاگری ژین بوو، لێواولێو بوو لە ئیحساسی ناسکی شاعیرانە. لە بۆن و بەرامی نانی تازە سەرڕێژ بوو و عەتری خەرمانانی هاوینی لێ هەڵدەوەری.*

*بە داخەوە هەموو ئێوارەیەکی ژیانی من لە ئێوارێکەی پارکی قەڵای حەسەن خانی تۆ دەچێ پڕە لە نامۆیی و دڵتەنگی، هەروەکوو هەموو ئێوارێکانی ئەم بەقوڕگیراوە. ئەلعان کە ئەو نامەیە بۆ تۆ دەنووسم باڵای خۆر وردە وردە لە داوێنی کێو دەخزێ و دەنگی کوندەبووی*

شەو بە دزە دزە دەنیشێتە سەر دار و دیواری وڵات، فرمێسکی خەم هەروەک هەمیشە لەسەر رووومەتم قەتیسە، ئاخر ئێرە وڵاتی خەمە، سەرزەوینی وەرهەمە، شەقامەکانی پڕن لە ماتەم، کووچە و کۆڵانەکانی پڕن لە تەم. چرای رۆژ وەک مەزرەق بە دەستی شەمشەمەکوێرەی شەوەوە دەخولێتەوە، پێکەنینی گورگ کارژۆڵەکانی ئەوین دەترسێنێ و پەنجەی دێوەزمەی ترس گەنجە بەئیحساسەکان دەتارێنێ، جا بە قەولی تۆ:

ئەوەی شادی لەنێو ئەو خەڵکە لابرد و خەمی دانێ
بە نووکی خەجەری تۆڵەی حەقئەستێنی خودادا چێ
یا بە قەولی شاعیرێکی فارس:
آسمانا دلم از اختر و ماه تو گرفت
آفتاب دگری خواهم و ماه دگری

خۆشم دەوێی
١٣٧٣/٥/١٧
وەفا

## تەنیا وشەیەک

*بۆ قافڵە سالاری شیعر و ئەدەب: ئەحمەد شاملوو*

گوتبوت:
نەمدەویست ناوی چەنگیز بزانم
نەمدەویست ناوی تەیموور بزانم
ناوی نادر بزانم و موحەممەدی خواجە
ئەو تاوانبارانە
ئەو خوێنمژانە؛
ئەمنیش نامەوێ ناوی هیتلێر بزانم
نامەوێ ناوی ستالین بزانم
ناوی پینۆشە و سەددام
ئەو دێوەزمانە
ئەو کاروانکوژانە؛
لە قوڵایی دڵەوە
لەوان و لەوانەی لەوان دەچن
بێزارم

****

گوتبوت:
دەمهەویست ناوی کەسێ فێر بم.
بەڵام فێر نەبووم
منیش:
دەردەکەم لە دەردی تۆ دەچێ گەورەم!
منیش

*دەیانساڵە*
*دەیانساڵی ڕەبەقە*
*لە وشەیەک دەگەڕێم*
*تەنیا*
*وشەیەک*
*بەڵام نایبینمەوە*

*{وەرگێڕاوی کوردیی شیعرە فارسییەکان لەلایەن مەڵبەندەوە ئامادە کراوە}*[١]

---

١ گۆڤاری مەڵبەند، لەندەن، ژمارە ٩٦، نەورۆزی ٢٠٠٦

## شیعرە فارسییەکانی وەفا

**(بە وەرگێڕاوی کوردیی دوو پارچە شیعرەوە)**

یۆنس رەزایی

شیعری فارسی لە دوای بزووتنەوەی مەشرووتە، بە چەندین هۆی جیاواز چ لە باری ناوەرۆک و چ لە باری فۆرم و شکڵەوە، گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەردا هات. بزووتنەوەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی وەک مەشرووتە، بێشک لە کۆمەڵگایەکدا دێتە ئاراوە کە ئەو کۆمەڵگایە بە هۆی چاو کراوەیی و فراوانتر بوونی ئاسۆی بینین و تێگەیشتنیان، لە زۆر بواردا خوازیاری بەدیهێنانی ئاڵوگۆڕە. لەو نێوەشدا هونەرمەنان لە ریزی پێشەوەی ئەو کەسانەن کە بە دەنگێکی دلێر نە تەنیا داوای ئاڵوگۆڕ دەکەن، بەڵکوو خۆشیان لە ساز کردنی پێکهاتە و بیچمی تازە و نوێدا پێشەنگن و پەردەی باو لە روخساری شتەکان لا دەدەن و پلانێکی نوێ بۆ بینین و باسی بابەتە پێوەندیدارەکان بە کاروباری خۆیان و کۆمەڵگاوە دادەڕێژن.

شاعیرانی دوای سەردەمی مەشرووتە، بە شێوەیەکی کارا ئاراستەی شیعریان لە فەزای وەهمی و دوور لە واقعەوە بەرەو ئاقاری کۆمەڵگا

و هەنــاوی ڕووداوەکــان پەلکــێش کــرد و بەو شــێوەیە لە گــۆڕینی ناوەرۆکی شیعردا بە پشوویەکی نوێتر لە ڕابردووەوە هاتنە مەیدان.
دوای تێپەڕینی ماوەیەک و تاقی کردنەوەی زۆر ناوەرۆک و واتای تــازە لە نێــو شــاعیرانی ئەو ســەردەمی وەک میــرزادەی عیشــقی لە شــیعری "ســێ تــابلۆی مــریەم"دا و فەڕوخــی یەزدی و شەمســی کەسمایی و... شاعیران و هونەرمەندان هەستیان بەوە کردبوو کە نــاوەرۆک و واتــای تــازە فــۆرم و پێکهــاتەیەکی تازەشــی دەوێــت و نیمایووشیج، بە ئاگاداری لەو قەڵشتە هەراوەی کەوتۆتە نێوان فۆرم و ناوەرۆک و بە ئاگاداری لە ڕەوتی شیعری جیهانی، لە بواری فۆرم و پێکهاتەشــەوە بە جەســارەتێکی هونەرمەنــدانەوە گۆڕانکــارییەکی بنەڕەتــی بەدی هێنــا. واتە ئەو فــۆرمە زاڵ و چەقبەســتووانەی تــا ســەردەمی نیمــا شیعریان پێ دەنووســرا، لەلایەن نیمــاوە وەلانــران و شیعری نیمایی کە لە یاسایەکی تایبەتی کێش ـ جیاواز لە یاساکانی عەرووزی پێشوودا دەگونجا، هاتە پانتایی شیعری فارسییەوە. یەکەم کاردانەوەکان لە ئاست گۆڕانکارییەکی ئاوا قووڵ و بنەڕەتی، هەمیشە نەرێتی و ناهاودڵانەیە، چون بیری باو بەر لە وەرگرتن و پەرەگرتنی ئەو بیــرە نــوێیە دەگرێــت، بەڵام بەردەوام هەن ئەو هونەرمەنــد و شاعیرانەی هەر چەشنە نوێکارییەکی بەجێ و بەبایەخ دەقۆزنەوە و پەرەی پێدەدەن.

عومەری سوڵتانی وەک شاعیرێکی کوردی فارسینووس یەکێک لەو یەکەم کەسانەیە کە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بە سنگێکی فراوانەوە لەگەڵ ئەزمــوونە نــوێیەکەی نیمــادا ڕووبەڕوو بــۆتەوە و چێــژی لــێ

وەرگرتـــووە و خۆشـــی بەو شـــێوازە زمـــانی شـــیعری نـــوێی تـــاقی کردۆتەوە.
ئەو وەک هەمـوو شـاعیرانی قوتـابیی نیمـا لە دەیەی سـیی هەتاویـدا، واتە زیـاتر لە پەنجـا سـاڵ لەمەوبەر، بە فرێـدانی واتـا سـواوەکانی شیعریی لە شیعری فارسیدا، هەوڵی بنیاتنانی ئەزموونێکی نوێی بۆ پەروەردە کردنـی واتـای تـازە و کەرەسـەی نـوێ لە شـیعردا داوە. ئەگەر شـاعیرانی هاوسـەردەمی ئەو لە شـیعری عەرووزی زیـاترین کەڵکەڵەیـان لاسـایی کـردنەوەی شـاعیرانی شـێوازی خوراسـانی و عیراقـی بـووە و نـاوەرۆکی شـیعرەکانیان بە واتـای قەسـیدەکانی "ئەنـــوەری" و "ســـەنایی" و غەزەلەکـــانی "ســـەعدی" و "حـــافز" و... ئـاخنراوە، ئەوا شـاعیرانی قوتـابیی نیمـا هەوڵـی کەڵـک وەرگـرتن لە بابەتی نوێ و نەگوتراویان داوە.
شـێوەی دابڕانـی ئەم شـاعیرانەش هەروەک خـودی نیمـا لە شـیعری پێشـوو، دابڕانێکی یەکجارەکی نەبووە، بەڵکوو هەمـووان سـەرەتا بە تـــاقی کـــردنەوەی قاڵبەکـــانی وەک غەزەل، چـــوارینە، دووبەیتـــی و... توانای خۆیان لەو بوارەدا نواندووە و هەوڵیان داوە ئەو قاڵبانە دەکار بێنن، بەڵام بە ناوەرۆکێکی تازەتر و داهێنەرانەتر لە شاعیرانی "خـولی گەڕانەوە"ی شیعری فارسی.

وەفا لە شیعری "کوندەبوو"دا بە سـەرنجدانە حاڵوبـاڵی بەندییەک، کە هەر خـــۆیەتی، لەگەڵ خـــاوەن بەنـــدیخانە دەدوێ و بەو شـــێوەیە بە خســـتنە رووی دوو چەشـــنە بەنـــدیخانەی واقیعـــی و بەنـــدیخانەی هەراوی هەســتی، بــاس لە چەشــنێکی دیــکەی روانــین بــۆ زوڵــم و چەوساندنەوە و بەندیخانە و جەزرەبەکانی مرۆڤ لە پانتایی هەستیدا

دەکـا. بەو شـێوەیەش، بە زەق کـردنەوەی دوو وێـنەی جیـاواز لە مرۆڤ لە دوو گۆشەنیگای جیاوازەوە، روانینی خاوەن بەندیخانە کە دەتوانێـت هێمـای هەمـوو دیاردەکـانی زوڵـم و چەوسـاندنەوە بێـت، دەداتە بەر تیـری تـوانج و رەخـنە و تێـی دەگەیێنـێ کە بـۆ ناسـینی مـرۆڤ پێویسـتە چـاویلکەی پـێش گریمانەکـان وەلا بنێـت. چـۆن مرۆڤێکی بەنـد کراو وەک مرۆڤێکی ئەویندار و پاک خـۆی پێ‌مەلـی ئەویندار و خۆشخوانی نێو ئەویندارانە و خاوەن بەندیخانە بە پێی ئەو روانینـە ناڕاسـت و ئـاوێتەی پـێش گریمـانەیەکی کە هەیەتـی، بە "کوندەبوو"ی دەزانـێ و دەبینـێ. بەڵام قـاڵبی ئەو شـیعرەی وەفا وەک زۆربەی شـاعیرانی ئەو سـەردەم کە نوێکـاریی خۆیـان لە قـاڵبی دووبەیتیی نوێدا دادەڕشت، دووبەیتییە.

**کوندەکوێرە:**

*هۆ خاوەنی بەندیخانە!*
*دەست هەڵگرە لە ئازارم!*
*بەندیخانەت تەمەنمی لە پەنجە لێڵەکانیدا ژاکاند*
*زنجیرو کۆتی کۆیلەییم لە پێ کەوە*
*کە زنجیرت*
*وە گیانی هێناوە هەناوی هێورم*

*دەست هەڵگرە لە ئازارم!*
*کە لە بەندیخانەی هەراوی هەستیدا*
*جگە لە ژانی دڵداری نەمچەشتووە*
*لە نێو هەلاڵە و بەیبووندا*

*جگە لە پنچکی دڕوو*
*هیچم بە نسیب نەبووە*
*بە پێکەنینی دزێوت*
*چیتر چکۆلەم مەکەوە*
*کە من لە پەنجەکانی مۆتەکەی زۆردا*
*بەند کراوم*
*من کە سەردەمانێک*
*پۆڕی کۆڕی عاشقان بووم*
*ئێستاکە هەزار مخابن*
*لە چاوانی ڕەشبینتدا*
*کوندێکی کوێری بزێوم...*
*حەیف و جەخار*
*جگە لە زایەڵەیناڵەی تاڵی مەرگ*
*لەو بەندیخانەیەدا نابیسرێ*
*بەستە و مەقامی ژیانەوە*
*لەو گۆڕە ڕەشەدا، بەڵێ*
*کە هەزار ئاواتی تێدا نێژراوە،*
*تروووسکەی هەسارەیەکی پیرۆز بەدی ناکرێ*
(سرودی پەرەستوو، چاپی یەکەم، ل٤١، وەرگێڕانی ئازاد بە دەستکارییەوە)

جگە لە ناوەرۆکی نوێی ئەو شیعرە کە باس لە بابەتێک دەکات پێش خۆی کەمتر باس کراوە، ناوی خودی شیعرەکەش ناوێکی نوێ و پڕ بەپێستە و وەبیر هێنەرەوەی ناوی ڕۆمانە بەناوبانگەکەی سادقی هیدایەتە، واتە وەفا، بە تیرێک چەند نیشانی پێکاوە. یەکەم ئەو

پێوەنــدییە تــۆکمەیەی کە لە نێــوان نــاوەرۆکی شــیعری و نــاوی شیعرەکەیدا هەیە، دەخـاتە روو، چـون بەنـدییەک کە کـۆت و بەنـدی کۆیلەیی لە ملدایە و زنجیر لە پێیە و لە چاڵێکی رەشـدایە، چەنـد لە تەنیایی کوندەبوو نزیکە. دووەم ئەوەی کە نایەوێت بڵێت ئەو بەندییە، کوندەبوویەکە کە ئیتر بە تاریکی راهاتووە و ئەویندارییشیەتی، بەڵکوو دەڵێـت ئەوە لە گۆشـەنیگای خـاوەنی بەنـدیخانەوەیە کە ئەو لە کونـد دەچێت، ئەگینا ئەو لە دوا کۆپلەی شیعرەکەیدا هاوار دەکات "حەیف و جەخار، ترووسکەی هەسارەیەکی پیرۆز بەدی ناکریٚ".

ئەگەر ناوی ئەم شیعرەش ئیرجاع بدەین بۆ دەرەوەی ئەو دەقە، هەر وەک پێشــتر گوتمــان، دەگەیــنە کونــدەبووی هیــدایەت کە لەو سـەردەمەوە تـا ئێسـتاش یەکێک لە بەرزترین چیرۆکە فارسییەکانە. بەڵام گرنگیی ئەو ئاوڕدانەوەیە لەوەدایە کە وەفا لە سـەردەمێکدا ئەو کــارە دەکــات کە زۆربەی بە نــاو مامۆســتایانی کلاســیکی فــارس کونــدەبووی هیــدایەت و خــودی هیدایەتیشــیان دابــووە بەر تیــر و تــوانجی نــاهونەری. ئەوە نیشــاندەری ئەو راســتییەیە کە عــومەری سـوڵتانی ئاگـای لە بـزاڤە ئەدەبییەکـانی سـەردەمی خـۆی بـووە و نە تەنیـا ئاگـای لێیـان بـووە، بەڵکوو شوێنیشـی لـێ وەرگرتـوون، هەم لە نیمای بەدیهێنەری شیعری نوێی فارسـی و هەم لە هیدایەتی داهێنەر. وەفـا بۆخۆشـی، دان بەو شـوێنوەرگرتن و ناسـیارییەیدا دەنێت. ئەوا لە شــیعری کونــدەبوودا نــاوی شــیعرەکەی بە قەرز لە هیــدایەت وەرگرتـووە و لە فۆرمـدا چـاوی لە نیمـا کـردووە و تەنـانەت رەنـگە بتوانین بڵێین تەنیا شاعیرێکی کوردە هەر لە سەردەمی مەرگی نیمادا، جگە لەوەی ئاگای لە کـار و شـیعری نیمـا بـووە، بەڵکوو مەرگـی نیمـا دەیهەژێنێت و شینیشی بۆ دەگێڕێت و لە شیعری "مەرگی مەسیحا"دا

هاوار دەکات: «دۆستەکانم با بێدەنگ بن/ هاوارێک دێ/ هەواڵی مەرگی نیمایە...»

بەڵام کاری گرنگتری وەفا هەر راست ئەو شیعرانەن کە بە شێوازی نیمایی نووسیونی. لەو شیعرانەدا بە وردی یاسا و رێساکانی شیعری نیمایی رەچاو دەکات و تەنانەت لە شێوەی وێنەسازی و تەکنیکی شیعریشدا نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ شاعیرانی سەرەتای ئەو رەوتە هەیە. شیعر بە کێشێکی عەرووزی بەڵام پچڕ پچڕ دەچێتە پێش، وێنەکان تەعبیر لە فەزاگەلێکی نوێ و نائاشنا بۆ خوێنەر دەکەن و بەتایبەت بۆ خوێنەری ئەودەم، شیعرەکانی "گەڕان"، "بەسەرهاتی نیوەڕۆ"، "پاشەکەوت"، "چیت دەوێ"، "دوورەدەست" لەو شیعرانەن. ئەگەرچی دەتوانین بڵێین ئەو شیعرانەش هەموویان یەکدەست نین، بەڵام وەک یەکەم ئەزموونەکانی شاعیرێکی نوێخواز جێگەی سەرنج و لێورد بوونەوەن.

لە کۆتاییدا دەتوانم بڵێم عومەری سوڵتانی وەک کوردێک کە نزیک بە پێنج دەیە لەمەوبەر شیعری فارسی نووسیوە و پەنجا ساڵێک لەمەو پێش کتێبی "سروودی پەڕەسێلکە"ی بە چاپ گەیاندووە، هەر ئەودەم مرخی شاعیرانە و توانای خۆی پیشان داوە، بەتایبەت گرنگ ئەوەیە کە بە ئاگادارییەوە رەگەڵ بزاڤی نوێخوازی شیعری فارسی کەوتووە، بەڵام مخابن ئەو کتێبە یەکەمین و دواهەمین بەرهەمی بووە و هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە نووسین و گوتن لەسەر شیعری ئەو دژوار بێت، چونکە ئێستا باس لە شیعری شاعیرێک دەکەین کە دوای ئەو کتێبە، کە پەنجا ساڵ لەمەو پێش چاپی کردووە، بە دەیان شێواز

و به هەزاران فۆرمی تازەی شیعری بینیوه و خوێندۆتەوه. ئایا وەفا دوای سروودی پەڕەسێلکە، هەنگاوی بەرەو پێشی بۆ دوور بوونەوه لەو یەکەم ئەزموونـــانەی خـــۆی له بەســـتێنی شـــیعری فارســـیدا هەڵگرتووه! ئەگەر هەنگاوی نابێت، ئەوا جێی خۆشحاڵییه و ئەگەر نا، ئەوا دەبــێ بڵێــین مخــابن بــۆ وزەیەکــی داهێــنەر کە تەنگــوچەڵەمەی هەستیی له شیعری دوور خستەوه و هەنگاوی پێ شل کردووه. بۆ وەڵامــی ئەو پرســـیارەش دەبــێ چـــاوەڕوانی بڵاوبـــوونەوەی بـــاقیی بەرهەمەکانی وەفا بین، تا بزانین دوای سروودی پەڕەسێلکە تا کوێ فڕیوه.

**سروودی پەڕەسێلکە**

*هەر ئێستاکەش کڵە پڕ تینەکەی ڕۆژ*
*بزه دەڕژێته سەر هەر بەرد و دارێک*
*هەر ئێستاش دەنگی گەرمی مەل دەبیسرێ*
*له سەر دوندی لقی سووره چنارێک*

*بەڵێ ئێستاش له لەرزەی باڵی کۆتر*
*دڵی عاشق دەلەرزێ رام و ئارام*
*شەرابی شەونمی ڕۆژی بەهاری*
*دڵۆپەی دێ له بەژنی سەوزی بادام*

*بەڵێ ئێستاش له کانیی مانگەشەوڕا*
*دەچۆڕێته چەمەن هێدی تەڵای قاڵ*
*غورووری پڕ گڕی فانووسی پەروین*
*لەگەڵ ناخی شەوی تار بوو به هاوماڵ*

*هەر ئێستاکەش لە فرمێسکی بەهاران*
*گوڵی خاشخاشی لاسووریان لە بەردا*
*لە سەر گۆمیلکەکان سەرمەست و شەیدا*
*پەڕەسێلکە هەوای عەشقیان لە سەردا*

*بەڵێ وا ئاسکی جوان کاتی بەیانی*
*بەرەو زەنوێر و دەشت و دەر سڵی کرد*
*بەڵێ وا بۆنی دووری نەرگسی مەست*
*لە کەللەی ڕێبواراندا گوڵی کرد*

*لە بانی بەربەیانی مەڕمەڕیندا*
*هەر ئێستاش تیشکی ڕۆژ دەڕژێتە خوارێ*
*لە شیعری پڕ لە هەستی دڵبزێوم*
*هومێدی سەوزی دواڕۆژ دادەبارێ*

*دەر و دەشت شەو لە بادەی پڕ بەرامە*
*سەری گەرمە بە پیاڵەی جوانی شەوبۆ*
*پەڕەسێلکەش بە دەنگی لێڵ و گەرمی*
*حەریری گوێی شەوی کردووە قەلاچۆ*

(سرودی پەرەستوو، ل٧٣، وەرگێڕانی ئازاد بە دەستکارییەکی کەمەوە)

**زستانی ١٣٨٤**[١]

---

[١] گۆڤاری مەڵبەند، لەندەن، ژمارە ٩٦، نەورۆزی ٢٠٠٦

## دەلاقەیەک بەرەو شیعری وەفا

هادی حەبیبی "هاوڕێ"

ئاشکراترین جیاوازی نێوان هونەرمەند و خەڵکی ئاسایی لە چۆنیەتی روانـین لە مەبەسـتگەلی کۆمەڵگـا و دنیـای دەوروبەردایە و هەر بەو پێیە زۆریەک لە رۆشنبیران لە سەر ئەو باوەڕەن هونەرمەند خاوەن دوو ژیان و دوو لە دایک بوونە. مارف لە وتوویژێکدا ئەو دیاردانەی کە ئەم جیاوازیـانە روون دەکـاتەوە بە "وەرینـی گەلایەک" یـان "کوژرانی باڵندەیەک" و "پشکووتنی گوڵێک" دێنێ کە هەر خەڵکێک ـ بە گشتی ـ لە ژیانی ئاسایی خۆیدا رەنگە چەندین جار تووشی ئەم دیاردانە هاتبێ و بە ئاسانی لە پەنایان تێپەڕ بووبێ. بەڵام جیاوازی لێـرەدایە کە مرۆڤێکـی شـاعیر بە پێـی ئەم ئەرکەی لە بەرانـبەر کۆمەڵگاکەیدا هەیەتی زۆر جار بۆ نموونە "وەرینی گەلایەک" لەگەڵ سامناکترین کات لە ژیانی مرۆڤ گرێ دەدا و فەلسەفەیکی تایبەتی پێدەخـولقێنێ. هەڵـبەت زۆر جـار ئەم ژیـاەنە ئاسـایییە دەبێـتە پێشەکییەک بۆ ژیانی راستەقینەی شاعیر و هەروەها سەرچاوەیەک بۆ خولقاندنی فکر لە کۆمەڵگادا.

ریمۆنـد کـارویر چیرۆکنووسـی ئەمریکـایی دەڵـێ: *«نووسـەر بـۆ خولقاندنی ئاسەوارەکەی دەبێ لە پێشدا لە دنیایەکدا بژی کە باوەڕی*

*پێی بێ و دواتر بە سەرنج دان بەو دنیایە، دنیای تایبەتی خۆی پێکبێنێ.»* دیارە لە نێو دنیای ئاسایی و دنیای تایبەتی نووسەریشدا جیاوازی هەیە و زۆربەی ئەو نووسەرانەی لە ئەدەبیاتی جیهاندا ماونەتەوە، بە هۆی دنیای تایبەتییان بووە، هەربۆیە دنیای تایبەتی نووسەرێک زیاتر جێی سەرنج دانە هەتا دنیای ئاسایی ئەو نووسەرە.

محەمەدی سەنعەتی لە "تحلیلهای روانشناختی در هنر و ادبیات" دا هونەر بەم جۆرە پێناسە دەکات: *«هونەر جۆرێکی تر خوێندنەوە و جۆرێکی تر دیتن و جۆرێکی تر بیستنە کە لەگەڵ خوێندنەوە و دیتن و بیستنی ئاساییدا، جیاوازە»* ئەم پێناسەیەش دیسان دەتوانێ جیاوازی نێوان روانینی هونەرمەند و خەڵکی ئاسایی روونتر بکاتەوە.

بەم پێوەرانە ئەگەر بمانهەوێ لەسەر ژیانی ئاسایی عومەر سوڵتانی "وەفا" بدوێین، ئەم شاعیرە ناسک خەیاڵە لە ساڵی ١٣١٨ی هەتاوی لە بۆکان لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٣٥ تێکۆشانی ئەدەبی و شیعری خۆی دەست پێکردووە. وەفا لە رەوتی ژیانی شیعریی خۆیدا لەگەڵ شاعیرانی مەزنی فارس وەک نوسرەتی رەحمانی و سەعیدی سوڵتانپوور دانیشتن و گۆڕینەوەی فکری بووە و لەگەڵ گۆڤارەکانی ئادینە و خووشە و چەن گۆڤارێکی تر هاوکاری ئەدەبی کردووە. کۆمەڵە شیعری "سرود پرستو"ی بە زمانی فارسی نووسیوە. "سرود پرستو" لەو کۆمەڵە شیعرییە سەرکەوتووانەیە کە بە دەگمەن شاعیر دەتوانێ بە زمانی غەیری زمانی دایکی خۆی بیخوڵقێنێ.

شەفیعی کەدکەنی دەڵێ: *«وەفا لەو شاعیرە بە توانایانەی ئەمڕۆیە کە وەک شاعیرێکی غەیری فارس، لە بەستێنی شیعری نوێی فارسیدا بە*

*باشی درەوشاوەتەوە.»* وەفا بە گشتی دوولایەنی کلاسیک و نوێی شیعری ئەزموون کردووە و ئاسەوارێکی بەنرخی خوڵقاندووە لە شیعری کلاسیک و نوێی کوردیشدا، هەرچەند بە داخەوە کۆمەڵە شیعری لێ کۆ نەکراوەتەوە ـ شوێنی تایبەتی هەیە و شیعری وەفا لە هەوەڵ چاوپێکەوتندا، شیعری سروشتە، شیعری ئاو و با و چنار و کێوە، شیعری شەمامە و شەبەقە. لە شیعری وەفادا مەزاهیری سروشت لەگەڵ خەیاڵێکی نەسرەوتووی چاوەڕواندا گرێ دراون، ئەم بەشە لە شیعری وەفا لە فەزایەکی رۆمانتیکدا دەژی و تایبەتمەندی ئەم مەکتەبە وەبیر خوێنەر دێنێتەوە. سەرنج بدەنە بەشێ لە شیعری «پرچی ئاڵەکۆک»:

*با دڵ بدەم بە ئاو*
*با دڵ لە پرچی ئاڵەکۆک و شنەی با*
*گرێ بدەم*
*با دڵ بە سەر لقی داری چنارەوە*
*هەڵاوەسم*
*با هەڵگرم لە کێوی وەفا*
بوخچەیەک گزنگ
*با لێوەکەم لە دەشتی هەڵاڵان، گوڵاڵەیەک*
*با هەڵکەنم بە پەنجەیەکی پڕ لە شەوقەوە*
*ڕێواس و کەنگر و لووشە و مەنێ و بەنا*
*برنم شەمامە لە بێستانی خۆرەتاو*
*بدزم لە دوور دوورەوە*
*بەرچینەیەک شەبەق*

*جانتایە پڕ بکەم لە تەڕە و کارگ و کەما*
*بێنم بە چنگ و چارەکە قەزوان و کووزەڵە*

(سروەی ٢٠٠، ل ٣٨)

جگە لە سروشتگەرایی، خوێنەر لە شیعری وەفادا هەست بە ئەشقێکی هەمیشەیی دەکا، ئەشقێ کە لەگەڵ هەر وشەیەکدا رەنگێکی تایبەت دەگرێ و زۆر جار شاعیر ئاواتەکانی نوقمی ئەو ئەشقە دەکا. وەفا شاعیری ئەشق و جوانییە و زۆر جار بە لەحنێکی ئاواتخوازانە باس لە ئەشقێکی ونبوو دەکا، ئەم هەستە لە شیعرەکانی "لەپی دەست، باوەش، بۆن، ناتەبا، پرچی ئاڵەکۆک، سپیدەنگدا ئاشکرایە و ئەوی لەم بەشەدا جێی سەرنجە، زمانی ساکاری شاعیرە، وەفا بە زمانێکی ساکار باس لە ئەشقێکی ونبوو دەکا و ئاواتەخوازە ئەم ئەشقە کارەساتی دەربەدەری و بێپەنایی کاڵ کاتەوە و تامی تاڵی سەرگەردانی لە گەروویدا بشواتەوە:

*بە کام شەڕاب مەستم دەکەی*
*هاڵاوی دەم*
*یان گوڵاوی سنگ و بەرۆک؟*
*بە کام شیعر هەستم دەکەی*
*نوێ یان غەزەل و چوارینە؟*
*بە کام زمان دەمدوێنی*
*نهێنی یان چرپەی ناو گوێ؟*
*کە هەر نەختێک*
*تەنیا نەختێک*

*کارەساتی دەربەدەری و بێپەناییم*
*کاڵ کاتەوە و*
*تامی تاڵی سەرگەردانی*
*لە گەروومدا بشواتەوە!*

(سروەی ١٧٤، ل٣٢)

بە دوای ئەشقدا، خاڵێکی تری دیاریکراو لە شیعری وەفادا، پرسیارە. شاعیر لە شیعری "ناتەبا"دا لە سەرەتاوە گومان و نائومێدی و بیرەوەری رابردووی دەکاتە پێشەکی ئەو پرسیارە. پرسیارێ کە فەلسەفەیەکی تایبەت لە شیعری وەفادا پێکدێنێ و لە قووڵایی ئەندێشەی شاعیرەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەم فەلسەفەیە، فەلسەفەی تەم گرتووی داهاتووە، فەلسەفەیەک کە جیهان بە شاعیر تەنگ دەکا و شاعیر بە پێشوازی گومانەوە دەبا:

*نیوەشەوە*
*دەستم بۆ خۆشەویستی دەگەڕێ*
*خەونی کاڵ دەبینم*
*هەموو دنیام پێ تەنگە*
*بە پێشوازی گومانەوە دەچم*

(ناتەبا، سروەی ١٥٢، ل٤٢)

تەنیا بە پێشوازی گومانەوە چوون نییە، بەڵکوو گومان چەشنێک نائومێدی لە شیعری وەفادا دروست دەکا، نائومێدییەک کە سەرانسەر پڕ لە بیرەوەری رابردووە. رابردوویەک کە شاعیر بە لەحنێکی پڕ لە ترس و هاوارەوە باسی لێدەکا و دەڵێی چاوەڕوانی رووداوێکی

سـامناکە، ئەو رابـردووە لە شـیعری وەفـادا بە چـریکەی ئەسـتێرەی شەو و هەوری لاری بەیانی خۆ دەنوێنێ:

*شەو بە بەریەوە نەماوە*
*چرای ژوورەکەم*
*وەک چرای دڵم*
*لە کووژانەوەیە*
*جووڵانەی گومانێکی لەمێژین*
*دەمبزوێنێ*
*ئەستێرەی شەو*
*"هەوری لار"ی بەیانی دەچریکێنن.*

(ناتەبا، سروەی ١٥٢، ل٤٢)

لەم بەشە لەو شیعرەدا، دوو خاڵ جێی سەرنجە کە نائومێدی شاعیر قورسـتر نیشـان دەدا. یەکیـان کە شـاعیر لە سـەرەتای شـیعرەکەدا مزگێنـی تەواو بـوونی شـەو دەدا بەڵام لەگەڵ تەواو بـوونی شـەو، چرای ژوورەکەشی وەک چرای دڵی لە کووژانەوەیە و شاعیر دڵێکی بە هـاتنی بەیـان خۆش نییە، دووهەم ئەوەی کە لە وەجهی شەبەهی کووژانەوەدا، شاعیر چرای ژوورەکەی بە چرای دڵی دەشووبهێنێ کە ئەوپەڕی نائومێدییە. وا دەردەکەوێ دڵی شاعیر لەمێژە کووژاوەتەوە و تەنیـا هیـوایەک کە شـاعیر بەدی دەکـا چـرای ژوورەکەیەتـی کە ئەویـش وەک چـرای دڵـی لە کـووژانەوەیە، دوای ئەم ناهومێـدییە، شاعیر بە پرسیار دەگا، پرسیارێکی بێوەڵام لە چارەنووسێکی هاڵۆز:

*من لە کوێم؟*
*لە کوێوە هاتووم؟*
*چ دەکەم؟*
*بە دوای کام پرسیاری بێوەڵامدا*
*وێڵم؟*
*ئەم جیهانە بەرینە*
*چەند بەرتەسکە*
*تۆ چەند گەورەی!*

(ناتەبا، سروەی ١٥٢،ل٤٢)

جگە لە سروشت و ئەشق و پرسیار، وەفا لە زۆربەی شیعرەکانیدا چاوەڕوانە، چاوەڕوانێکی نەسرەوتوو کە بە زمانی خەیاڵ قسە دەکا، چاوەڕوانی و خەیاڵ لە شیعری وەفادا وەها تێکهاڵاون کە بێیەک ناژین. بەو جیاوازییە کە خەیاڵ لە رواڵەت و چاوەڕوانی لە دەروونی شیعرەکاندا خۆ دەنوێنێ، یان دەکرێ بڵێین زمانی خەیاڵ ئاشکراتر و زمانی چاوەڕوانی نهێنیترە. زمانی خەیاڵ لە شیعری وەفادا، زۆر جار زمانی پێداهەڵکوتنە، ئەو زمانەی کە شاعیر خەیاڵ و چاوەڕوانی خۆی پێدادەمرکێنێ، ئەم هەستە لە شیعری "لەپی دەست، باوەش، شاگەشکە"دا بە باشی ئاشکرایە، لە سەرەتای شیعری سپیدەنگدا شاعیر خەیاڵ و چاوەڕوانی خۆی دیسان ئاوێتەی پرسیار دەکا:

*لە کام شوێنەوە بەرەو پیرت بێم؟*
*لە کام دەلاقەوە سەیرت بکەم؟*
*لە کام دەروازەوە بتدوێنم؟*

*کە دڵۆپێک لە ڕووباری سپیی دەنگت*
*بڕژێتە سەر زامی کۆنی تەنیاییم و*
*کوڵی دڵم دامرکێنێ!*
(سپیدەنگ، سروەی ١٧٤، ل٣٢)

هەر خاڵێکی دیاریکراو لە شیعری وەفادا، بە چەشنێک دەیسەلمێنێ کە شیعری وەفا سێبەری مەکتەبی رۆمانتیسمی بە سەرەوەیە و ئەو تایبەتمەندییانەی بە لای رۆمانتیکەکانی فەرانسەوە گرنگە، لە شیعری وەفاشدا دەبیندرێ. بۆ نموونە رۆمانتیکەکانی فەرانسە جگە لە جوانی، تێدەکۆشن دزێوی و ناحەزیش لە ئاسەوارەکانیاندا بنوێنن، لایەنگری جوانی و رەنگ و دیمەنن و پێیان وایە نووسەر دەبێ بۆ خولْقاندنی بەرهەمێک بە تەواوی ئازاد بێ و بە هیچ جۆرێک لایەنگری هیچ قەید و بەندێک لە شیعردا نین، بۆ نمونە هۆگۆ لە پێشەکی شانۆنامەی *"ئەرنانی"*دا دەڵێ: *«رۆمانتیسم یانی ئازادیخوازی لە هونەردا»* وەفا وەک شاعیرێکی رۆمانیتک لە شیعری "لەپی دەست"دا لای وایە کاتێ خۆشەویستەکەی تووڕە دەبێ جوانترە. وەفا جگە لە بزە، تەنانەت تووڕە بوونیشی خۆش دەوێ و لایەنگری جوانی و دیمەنە، باشترین بەڵگە بۆ ئەو بەشە وێنە زیندووەکانی شیعری وەفایە، لە هیچ شیعرێکیشدا وەفا لایەنگری قەید و بەندێکی تایبەت نییە و هەر لەبەر ئەوەشە زۆر جار شیعرەکانی هەرچەند بە رواڵەت لە یەک نزیک بن، لە دەروونددا هەرکام تایبەتیی خۆیان هەیە و بە هەناسەیەکی جیاواز لە یەکتر دەژین. ئازاد بوون لە هەر چەشنە بەندێک، رەنگێکی تازەی بە شیعری وەفا داوە، ئەو ئازادیخوازییە زۆر جار بۆتە هۆی غەریب بوونی شاعیر کە غەریب بوونیش، دیسان تایبەتمەندییەکی سەرەکی

مەکتەبی رۆمانتیسمە، شاعیری رۆمانتیک دوای غەریب بوون، پەنا بۆ دنیای ژوورەوەی خۆی دەبا و گیرۆدەی دنیای خەیاڵاوی خۆی دەبێ، بۆیە وەفاش وەک هەر شاعیرێکی رۆمانتیک، غەریبە و بە دوای جەستەی ونبووی خۆیدا سەرگەردانە هەتا بە زمانێکی بێزمانی بە کۆمەڵگاکەی بسەلمێنێ:

*ئای.. چەندە غەریبم*
*لەوانەی وا خۆشم دەوێن*
*چەند نامۆم*
*بۆ ئەوانەی خۆشیان دەوێم*
*چلۆن ون بووم*
*لە شەقامی فێ لێهاتوویی*
*ئەم ژیانەدا...*

(سپی دەنگ، سروەی ١٧٤، ل٣٢)

سەرچاوە و پەراوێز:
١. گۆڤاری مەهاباد، ساڵی سێهەم، ژمارە ٣٠، خەرمانانی ١٣٨٢، ل٢٥
٢. ریموند کارور، کلیسای جامع، ترجمه فرزانه طاهری، تهران، نیلوفر، ١٣٧٧، ص١٩
٣. محمد صنعتی، تحلیلهای روانشناختی در هنر و ادبیات، نشر مرکز، تهران، چاپ اول، ١٣٨٠
٤. وەڵامی ئەم پرسیارانەم لە زمانی خۆی (مامۆستا عومەر سوڵتانی"وەفا")وە بیستووە.
٥. دانیشتنێکی تایبەتی من و هاورێم کاک عەبدوڵڵا ئەولازادە لەگەڵ دوکتور شەفیعی کەدکەنی، ٢١ خەرمانانی ١٣٨٣، تاران
٦. رضا سید حسینی، مکتب‌های ادبی، (ویرایش٢)، تهران، موسسه انتشارات نگاه، جلد اول، ص١٧٩
٧. وەک سەرچاوەی شیعرەکان، لە گۆڤاری سروە بە ژمارەی ٢٠٠/ ١٥٢/ ١٨٤/ ١٧٤/ ١٦٥/ ١٦١/ ١٥٦/ ١٥٨ کەڵکم وەرگرتووە.[1]

[1] گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٥٣، گەلاوێژی ٢٠٠٥

## یادی خۆشەویست عومەر سوڵتانی "وەفا"

برایم فەڕشی

داگیرساندنی مۆمێک لە تاریکی شەوەزەنگدا، گەلێک بوێرانەترە لە ڕۆشن کردنی پرۆژۆکتۆرێک لە ڕۆژێکی ڕووناکدا. گوتنی دێڕە شیعرێک لە کاتی یاساخ بوونی شیعردا، گەلێک بەنرخترە لە بڵاو کردنەوەی دیوانە شیعری کاتی ئازادی، دەنگ هەڵبڕین لە کاتی وسکووتی و بێدەنگیدا گەلێک جوامێرانەترە لە قیژە و هەرای کاتی سەربەستی. ڕاستبێژی لە وڵاتی درۆدا گەلێک زەردەشتانەترە لە ئاڵا هەڵگرتنی ڕاستی لە وڵاتی ڕاستیدا.

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گەلێک ئینسانی وامان هەیە، کە ئەگەر ملیان بە پەتی سێدارەوە نەکرابێ و تیغی گیوتین نەیپەڕاندبێت و گەیشتبنە لێواری ئازادی، لە ناو قیژە و هەرادا، بێدەنگ بوون و لە ناو ڕۆشنایی ڕۆژدا لە بەر چاوان ون بوون. ئەمە هەر ئێستاش چارەنووسی هەزاران هونەرمەند و نووسەر و شاعیرو سیاسەتمەدار و ڕاستبێژانی ئەم جیهانەیە. تەنیا مەرگ ئەوان وەبیر خەڵک دەخاتەوە. ئەویش بۆ ماوەیەکی کورت.

ناوی عومەر سوڵتانی و نازناوی شیعری "وەفا"یە. ساڵی ١٣١٨ لە یەکێک لە کۆنترین گەڕەکەکانی شاری بۆکان لە دایک دەبێت. لە بەندیخانە شیعر لە ئامێز دەگرێ و پاشان کۆتوبەندی شیعری کۆنی فارسی دەپچڕێنێ.

وەفا لە رۆژگارانی کپ و کڕی سەردەمی پاشایەتیدا، شیعری دەگاتە رادیۆی دیهلی لە هیندوستان و پلەی یەکەم لە کێبەرکێی شیعری فارسی زماندا، دێنێتەوە و لێی دەگێڕنەوە بچێت بۆ وڵاتی هیندوستان، بەڵام بۆی نالوێ و لە تاران لە باڵوێزخانەی هیندوستان لە ڕێوڕەسمێکی رەسمی و ئیداری دەوڵەتیدا جگە لە خەڵاتی تایبەتی، ٥ کتێب بە ئیمزای جواهیر لەعل نیهرۆ وەردەگرێت.

لە دەورەی سەربازیدا لە شاری مەهاباد بەرپرسی رادیۆی کوردی سەربازخانە دەبێ، پاشان یەکەم کتێبی بە ناوی "سرود پرستو" بڵاو دەکاتەوە. وەفای جوانیپەرست، ساڵی ١٩٨١ شارە جوانەکەی بۆکان، بەجێ دێڵێ و ١٥ ساڵ بە خەیاڵی گەڕانەوە بۆشارەکەی لە تاران دەژی. لە ساڵی ١٩٩٦ەوە لە باوەشی بۆکاندایە و ئێستا...

کاتێک منداڵ بووم، ئەم شیعرانەم لە زاری خەڵکەوە بە تایبەت لە خەڵکی گوندەکانەوە کە دەهاتنە شاری دەبیست:

*بۆ پێشەوە جووتبەندە*
*دنیا بە تۆوە بەندە*

***

*دەستم بۆ بێنی دەستت دەشکێنم*
*بۆ دەنکە جۆیەک، چاوت دەردێنم*

***

*دیهقانی ئازاد، ریش پەڵە پەڵە*
*ئەسپێی پشت ملیان دەڵی کیسەڵە*

دەبێ ئەم سێ کۆپلە شیعرە، هی سێ شاعیری جیاوازی بۆکانی بن، کۆپلەی یەکەم شیعری وەفایە، دووهەم رەنگە شیعری ح.س. سۆران بێ و کۆپلەی سێهەم نازانم هی کێیە. شیعری یەکەم و دووهەم بە لایەنگری لە مافی وەرزێڕان نووسراون کە تایبەتمەندی بۆکان و ناوچەکەش دەردەخەن.
ئەمە بۆ من سەرەتای حەزێک بوو، حەزی گەورە بوون و تێکەڵ بوون لەگەڵ شاعیرانی ئەم شیعرانە. هەموو جارێک دەچوومە بەر دووکانەکەی و بە بیانووی تەماشا کردنی تەلەفزیۆن و یەخچاڵ و رادیۆ، سەیرم دەکرد بزانم کام شاعیر و کام نووسەری لێ میوانە. دۆستەکانم دەیانگوت براکەی سیاسییە و لە زیندان بووە و بەردراوە و ئێستا لە دووکانی براکەیەتی، دەی هەڵێ بۆ بەر دووکانی وەفا. دووکان قەرەباڵغە و یەک دێ و یەک دەڕوا. تەنیا شتێک کە بە من بڕا، دەیان سڵاو بوو کە لە مامۆستاکانی مەدرەسەم دەکرد، کە دەهاتن و دەچوونە ناو دووکانەکە.

وای لێهات ئێمەش گەورە بووین و کاتی خۆ ڕاوەشاندنمان گەیشت، کاری شانۆ، چیا بڕین و ئەشکەوت پشکنین و وەرزش و هەستان و دانیشتن لەگەڵ سیاسییەکانی شار بوو بە کار و زکری رۆژانەمان.
ساڵ، ساڵی ١٩٧٨ە و جووڵانەوەی شارەکان دەستی پێکردووە. خۆ پیشاندانی خوێندکارانی خوێندگەکان دژی شارەبانی (پۆلیس) بۆ

پشتگیری لە یەکێک لە مامۆستا سەربەرزەکانی بۆکان، بەرپا کردنی پیشانگای کتێب و شانۆ و کۆڕ و کۆمەڵی هونەری و ئەدەبی. لەم بەینەدا هەفتەی جارێک دیوارەکانی شەقام و کۆڵانەکانی شاری بۆکان، بە بڵاو کراوەکانی هێزە چەپەکانی ئێران دەڕازایەوە. بە دەگمەن کەسێک دەیزانی ئەم بڵاو کراوانە چۆن دەگەنە بۆکان، چۆن لێیان زیاد دەکرێ و چۆن دەچنە سەر دیوار؟

دوو کەس ئاگاداری ئەم نهێنییە بوون، عومەری سوڵتانی "وەفا" و برایم فەرشی. برایم فەرشی هەفتەی جارێک، ئێوارەی هەر پێنجشەممەیەک لە تارانەوە دەگەیشتە بۆکان و یەکڕاست دەچووە سەرتاشخانەکەی بەرانبەر دووکانەکەی وەفا. خاوەنی سەرتاشخانەکە ئازەری بوو، پیاوێکی جێگای ڕێز، بەڵام بێسەواد. بە گەیشتنی مشتەری دەرگای دووکانی دادەخست و دەزگای کۆپی هەڵدەکرد. کۆپی کردنی بڵاو کراوە دەستی پێدەکرد و کۆتایی پێدەهات. ئەوجا پاش جیا کردنەوە و دەستەبەندی کردن، بە سەر ماڵە دیاری کراوەکاندا بڵاو دەکرایەوە و ڕۆژی دوایە، یان دەستاودەست دەگەڕا و یان بە سەر دیوارەکانەوە دەبیندرا. خاوەنی ئەم دەزگا کۆپییە عومەری سوڵتانی بوو. بۆ ئەوەش کاکی سەرتاش دوودڵ نەبێ و شک نەکات، بۆ هەر لاپەڕە کۆپی کردنێک، ٢ قڕانی شاهەنشاهی وەردەگرت.

بڵاو کردنەوەی بڵاو کراوە نهێنییەکان پاشان پەرەی ساند و کەسان و گرووپی دی ئەم کارەیان دەکرد، بەتایبەت لەم دەورەدا لایەنگرانی کۆمەڵە بە زمانی کوردی بە بێئیمزا بڵاو کراوەکانیان بڵاو دەکردەوە. هەر لەو سەروبەندەدا بە دژایەتی ئەم و ئەو ناوی خەڵکانێک بڵاو دەکرایەوە، کە گوایە خاوەنی ئەم ناوانە ساواکین.

کاک عومەر سۆزی لە من وەرگرتبوو نهێنی چاپی بڵاوکراوەکان بە دەزگا کۆپییەکەی ئەو، لای کەس نەدرکێنم، بەڵێنەکەشم تا ئێستا بردۆتە سەر، پێی وا بووە بڵاو کردنەوەی ئەم چەشنە نووسراوانەش هەر کاری منە، کە لە راستیدا من هیچ ئاگام لێیان نەبوو.

## ئۆغول گوێرسەن نە دۆستلارم واردی!

کامران ئەمین ئاوە

شەوێک پێش ئەوەی کاک عومەری وەفا کۆچی دوایی بکا و دۆستان و ئازیزانی بە یەکجاری بەجێ بێڵێ، شیعر و نووسراوە کورتەکەی کاک ئەنوەرم دەخوێندەوە کە باسی نەخۆشی و ناڕەحەتی کاکی کردبوو. قەت پێم وانەبوو ئاوا زوو خەبەری تاڵی ماڵئاوایی کاک عومەر دەبیستم، سەعاتی ١٠ شەوی سێشەممە لە ڕێگای سایتی بۆکانەوە هەواڵی کارەساتەکەم زانی. دەڵێن بیری منداڵی تیژە، من دەموچاوی کاک عومەرم هەر ئەو جۆرە لە بیر ماوە کە لە وێنەکانی سەر سایتی ڕۆژهەڵات هاتووە. وێنەی تازەی کە دەگەڵ شیعری هاواری بێدەنگی کاک ئەنوەر بڵاو بۆتەوە، بۆ من غەریب و نائاشنا بوو. ئینسان کاتێک دوور دەکەوێتەوە، لە دونیای خەیاڵیدا هەموو شتێک وەک ئاخرین جار کە دیتوویەتی دەمێنێتەوە و تێپەڕ بوونی ڕۆژگار کار لە سەر وێنەکانی خەیاڵی ناو مێشکی ناکات.

منیش وەبیر کاتی منداڵیم کەوتمەوە، ئەو کاتەی کە تەمەنم ژێر ١٠ ساڵ بوو. لە گەڕەکی ماڵی زیایی نزیک ماڵی محەمەدی ڕەمەزانی، لە

گەڕەکـی جوولەکەکـان کرێنشـینی کەسـێک بـووین کە لە ئیـدارەی پۆست کاری دەکرد. بە داخەوە نـاویم لە بیر نەمـاوە. [ئاغـای سـاڵحی] سەری کۆڵانەکە دەگەیشتەوە شەقامی سەرەکی شـار کە رووبەڕووی دووکانەکەی کاک عومەر بوو. دووکانێکی گەورە و پڕ لە کەرەسـەی ئەلەکترۆنیکی وەک یەخچاڵ و تەلەفزیۆن...!

تلەویزیـۆن تـازە هـاتبووە بۆکـان و جەمـاعەت باسـی قوتـوویەکی سێحراوییان دەکرد. سەیر بوونی ئەم قوتـووە زۆرتر لە داستانەکەی جانیدالێری رادیۆ دەچوو. ئەوکات بەرنامەی تلەویزیۆن دوای سەعات ٥-٤ی ئێوارە دەستی پێدەکرد و ئێواران گۆرانی و. . . ی پیشان دەدا. ئەو سـەردەمە وەک ئێسـتا نەبـوو کە هەر ماڵێک تلەویزیـۆنی هەبـێ. تلەویزیـۆن بـۆ زۆربەی خەڵـک نە تەنیـا شـتێکی سـەیر بـوو، بەڵکـوو شتێکی لوکس بوو کە کڕینی لە توانای هەرکەسدا نەبوو. ئێواران بەر دووکـانی کـاک عـومەر قەرەبـاڵغ دەبـوو. دەرزیـت هەڵاویشـتبا نەدەگەیشـتە عەرزی. منداڵان بـۆ دیتنـی تەلەویزیـۆن دەچـوونە سـەر دارەکـانی هەر دوو بەری شـەقامەکە و دەمەقڕەیـان لـێ پەیـدا دەبـوو. هەمـوو دەیانویست تەماشـای ئەو قوتـووە سیحراوییە بکەن کە کـاک عومەر بەرەو خیابان ریزی کردبوون و خەڵک تەماشـایان دەکرد. لە دەستپێکدا تلەویزیۆنەکان تەنیا بەرفەکی رەش و سـپییان نیشـان دەدا، بەڵام دوای مـاوەیەک کـاک عـومەر دەڵقێکـی شـینی ئاسـمانی لە پـێش تلەویزیۆنەکان دادەنـا و خەڵک دەیـانتوانی بە رەنگی ببیینن. من قەت نەمـــدی کە کـــاک عـــومەر لە بـــوونی ئەو هەمـــوو خەڵـــکە لەبەر دووکانەکەی تووڕە و ناڕەحەت بێ، یا بۆ بڵاوە پێکردنـی جەمـاعەت

تلەویزیۆنەکان بکووژێنێتەوە. نێو دووکانەکەشی پڕ بوو لە هاوڕێیانی خۆی و رۆشنبیرانی ئەوکاتی بۆکان.

من لە تەمەنێکدا نەبووم کە زۆر لە شیعر و شاعیری سەر دەربێنم بەڵام باسی کاک عومەر و کاک ئەنوەرم لە باوکم دەبیست کە دەیگوت دانشجووە و رەوانەی بەندیخانەی شا کراوە. یەکەم جار کتێبی "سرود پرستو" م دوای شۆڕشی ساڵی ١٣٥٧ لەماڵی پوورم دیت کە کرێنشینی دایکی کاک عومەر بوون. ئەگەر چاکم لە بیر مابێ سەربەرگەکەی سەوز بوو. من دانیشتم و بە ئیشتیا خوێندمەوە، چاکم لە بیرە کە یەکێک لە پارچە شیعرەکانی پێشکە بە سەعید سوڵتانپوور کردبوو. نازانم چی بوو بەڵام دوای ئینقلاب کاک عومەر دووکانەکەی بەست و چوو بۆ تاران. ئێمەش رێگامان کەوتە تەورێز و دوایەش من سەرم لە باکۆ و مینسک و بەرلین دەرهێنا.

٥-٦ ساڵ لەمەوبەر کە دانیشتووی شاری بەرلین بووم، بیستم کە کاک عومەر میوانی کاک ئەنوەرە. کتێبێکم بە ناوی "کوردستانی ئەمڕۆ" لە زمانی رووسییەوە هەڵگەڕاندبۆوە سەر زمانی فارسی کە چاپ و بڵاو کرایەوە. یەک دوو کتێبێم بۆ کاک ئەنوەر نارد. رۆژێک بە تەلەفون قسەم لەگەڵ باوکم دەکرد، باسی کتێبەکەم بۆ کرد و پێم وت کە کاک ئەنوەریش ٥ دەقیقە لە بەشی کوردی دەنگی ئەمریکا باسی کردووە. وەڵامی دامەوە لە رێگای کاک عومەرەوە باسی کتێبەکەی بۆ کاک محەمەدی زاوامان کردووە، ئاگاداری کتێبەکەیە. زۆر بە شانازی و غوروورەوە گوتی: «ئۆغول گوێرسەن نە دۆستلارم واردی؟». (کوڕم دەبینی دۆستی چۆنم هەیە؟) بەڕاستیش باوکم رێزێکی زۆری

بۆ کاک عومەرو کاک ئەنوەر هەبوو، بەتایبەت کاک ئەنوەری زۆر خۆش دەویست.

ئێستاش کە نە باوکم ماوە، نە کاک عومەر و نە ئاغای پیران و نە کاک تەها تەحریریان، نە زۆربەی هاوتەمەنەکانی ئەوان کە سەردەمێک شانازی شارەکەمان بوون. وەرن یادیان زیندوو راگرین، یادی ئەوان و کەسانی وەک حەسەن قزڵجی، سولەیمان تیکانتەپە و زۆر کەسی تر کە مایەی سەربڵیندی و شانازی شارەکەمان و کوردستان بوون.

بەڵام وەرن رێزی ئەو کەسانە کە تا ئێستا زیندوون و لە دەوروبەرمانن زۆرتر بگرین.

سەرماوەزی ٢٧٠٥ ـ ئەمریکا[١]

[١] ماڵپەڕی www.bokan.de

## ئەگەر تۆ فرمێسک بای...

نادر فەتحی

وەختـایەک خەبەری فەوتـی کـاک عـومەر وەفـام پێگەیـی، هەمـوو ئەو بیرەوەرییـانەی لەگەڵ ئەو خۆشەویسـتەم هەبـوو، وەک فـیلم بە بەر چاومدا تێپەڕ بوون!

کـاک عـومەر هەڤـاڵی بـاوکم بـوو، جاروبـار هـاتوچۆی دووکـانەکەی ئـێمەی دەکـرد و یـا مـن لەگەڵ بـاوکم دەچـووینە دووکـانەکەی. زۆر کەس دەهاتنە دووکانی ئێمە، بەڵام لە چـاوی منەوە وەکوو منداڵێکی ١٢ ساڵان، ئەو لەگەڵ هەموو ئەوانی تر فەرقی هەبوو. چەشـنی قسـە کـردنەکەی، ڕووخۆشـییەکەی، لیبـاس لەبەر کـردنەکەی، بـۆن خۆشییەکەی، هەڵسوکەوتی لەگەڵ مرۆڤ و بەتایبەت لەگەڵ منداڵێکی وەک مـن. تایبەتمەنـدیی خـۆی هەبـوو. کـاتێ لەگەڵـم دەدوا خـۆم بە گەورە دەزانی، کەیفم پێ دەکرد، من ئەودەم نەمدەزانی کە ئەدیب و

شاعیرە، بەڵام ئێستا دەزانم بۆ لەگەڵ ئەوانی تر جیاوازی هەبوو، بریا ئەودەم....

*ئەگەر تۆ لە چاوەکانمدا فرمێسک بای،*
*هیچ کات نەدەگریام*
*بۆ ئەوەی تۆ لە دەست نەدەم!*

خەسارێکی گەورە بوو، بۆ هەموو ئەدیبان و شیعر دۆستان.
من لە لایەن خۆمەوە کە بەڕاستی ڕێزم بۆی هەبوو، سەرەخۆشی لە هەموو بنەماڵەکەی دەکەم، بە تایبەت کاک ئەنوەری سوڵتانی.

ئاڵمان
سەرماوەزی ٢٧٠٥[١]

---

[١] ماڵپەڕی www.bokan.de

## وەفا

سولەیمان فەڕشی

گەڕانەوەم مەیی، لە نێو حەساری چارەنووس
بە خۆم نییە کە هەر دەڵێم، پسا رەگی حەسانەوەم
ئەتۆ دەڵێی پەژارەیە، کە بوو بە چەتری سەر دڵم
ئەوە چ بوو کە هەڵفڕی لە جێژوانی هەوەڵم

پاییز! بۆ وا دەکەی لەو دڵە پەرەواز بووە،
لە خۆشەویستیی وڵاتەکەم؟
باوەش باوەش بە فرمێسکی چاوەکانم گەڵا دەشۆمەوە و
مزگێنی بەهاریان دەدەمێ!
بۆ بەو هەورە رەشانەت ناڵێی
لاچن لە سەر شەو و ئەستێرەکان؟
بۆ بەرۆکی حەسانەوەت لێ گرتووم،
بۆ ناهێڵی شین بم هەتا بەهار دادێ؟

بە بێ بارانی و وشکەساڵی راهاتووم!
وشەکانی شاعیرانی وڵاتەکەمە دەبنە باران،
سەرووپرچی هەموو دارەکان دەشۆنەوە

بۆ لێم ناگەڕێی بحەسێمەوە لە جێژوانی ئەستێرەکان؟

لاسکە گەنمەکانی موکریان خۆر چاک دەناسن و
پێی راهاتوون،
من پێم خۆشە ئەستێرەکانی وا دێنە باوەشی خاکەوە،
حەریری ئالآی ولآتەکەم بە سەر شانیانەوە بێ،
پێم خۆشە ئەستێرە بن لە سەر سینگی ناڵەشکێنە!
ئەرێ ناڵەشکێنە چەند ساڵی دی
بەرگەی ئەو هەمووە خەمە دەگری؟
بۆگڕ ناگری بە تیشکی ئاگری ئەو هەموو شەمە؟
بۆ نابی بە هەزاران کۆتر،
بڕۆی بەرەو پیری ئاسمان؟
تا کەنگێ بە چاوەڕوانیی کوژانی ئەستێرەکان دەڕوانی؟

چوومە سەر هەر دەریایەک،
باسی دەریای دڵی تۆم کرد،
کە چۆن هەزاران ئەستێرە
بەخێو دەکەی بە تەنیایی!

تۆ پێت وایە بە تەنیا ماویەتەوە؟
ئەی ئەوە نییە بە کۆڵمەوەی،
بۆ هەموو شوێنێک دەتگێڕم؟
وشەکانم پێیان خۆشە،
هەموو رۆژێک

به ئاوی حەوزە گەورە رووومەتیان بتەزێ
لە داوێنی ناڵەشکێنە شین بن!
وەرن بە پەپوولە بێڵن
ببێتە شیعر و هەڵفڕێ،
بە باڵی ئارەزوو بڵێن
پەردەی بێدەنگی دادڕێ،
دەڵێم لە شارێک نزیک ببمەوە،
کە ئەستێرە بەخێو دەکا
کوا پێم دەکرێ
باری خەمی شارێک و وڵاتێک بە تەنیا هەڵگرم؟
بە بێ بارانی و وشکەساڵی راهاتووم،
بە بێ وەفایی و بێدەنگی رانەهاتووم،
کوا پێم دەکرێ بە بێ "وەفا" بژیم؟

١ی سەرماوەزی ٢٧٠٥
کۆڵن، ئەڵمانیا[1]

---

[1] ماڵپەڕی www.bokan.de

## بۆ مامۆستام "وەفا"

میدیا

ئەی مەلی خۆش‌ناوی وەفا
ئەی هومای بەختی ئاسمانم..
چ نوقمێ بوو ئەم پاپۆڕەی لەشی تۆ
لە دەریای هیوای مە.
سەرم سووڕماوە چلۆن باوەڕ
بە ئازاری فڕینی ئەبەدییت بکەم
ئەی بلوێری خامۆش
کێوەکان مات و بێدەنگی تۆن
"تۆلەکە" و "بێژینگ بەسەر"
"ناڵەشکێن" و "کەڵتەگە" و "کێوەڕەش"
ئەی مەلی خۆشناوی وەفا
ئەی چاوی بینایی شار
زۆرمان بیستووە دەرحەق بە بوونی رابوونت
ئەو کاتەی نەمامی بیروڕات سەری هەڵدا
کە ئەوسا هەستا دەنگت

لە کۆڵانی کۆنی حەوزە گەورە
لە کۆخە پڕ گەنجەکەی "میرزا عەبڵا"
تیشکی بەیانێکی نوێ بوو دەنگت
لە رۆژهەڵاتی دواکەوتووی زەمان و زەین و
لە دوای لەشی شەکەتی شیعر و شۆڕشی بیستوچوار
ئەی مەلی خۆشناوی وەفا
پەڕ بە پەڕی ئەمڕۆی ئێرە
واڵایە لە سۆمای چاوی تۆ
دەزانێ هێشووی بەری ئەم باخە ڕەزە
لە هەوای هەناسەی تۆوە بەری هێناوە
بە ئەسرینی شەونخوونی زۆر شەوانی
شارت
زارۆی کازیوە رابوو لە خەو
ئەو شەوانەی شاریان لە خەو کرد
بۆ پاساوی ماڵەوماڵ سەربەستی خۆیان
ئەو شەوانەی تەمی ترسیان
وەکوو چارشێوێکی نەگبەت
بە سەر شاردا سەپاند
ئەو شەوانەی بێدادیان دامەزراند و سێدارەیان هەڵبەست
چەکی قەڵەمت رانەوەستا
چەکی دەنگت،
بێدەنگ نەبوو،
شانی هیممەتت دایە بەر
بۆ خانووی نوێی دواڕۆژی شیعر و ژیان

"پەڕەسێلکە"ت ڕەوانەی باخچە کرد
ئەی مەلی خۆشناوی وەفا
کوا چاوی هەست و هۆشم
بڕوا بکا
بە خامۆشیی تۆ؟
بڕوا بکا
بە خامۆشیی تۆ؟

٢٠٠٥/١١/٢٦[١]

[١] گۆڤاری مەڵبەند، لەندەن، ژمارە ٩٦، نەورۆزی ٢٠٠٦

## پێم خۆشە خەمت بمێنێ

فایق سوڵتانی

چ تاڵ و دڵتەزێن بوو دیتنت
لە دوایین دیدار
نەمدەزانی لە کام سووچەوە بێمە سەیری چاوت
- چاوی بە فرمێسکی هەناو ویشکهەڵگەڕاوت -
وشەی سەوز و سوورم دەدیت بە خەیاڵتدا دەگەڕان
بێ ئەوەی دەرەتانی دەربڕینیان هەبێت
ئەو ئەندامە لاوازە بێ"وەفا"یە بەندیخانەی هەست بوو،
بەڵام شعوور نا، هەرگیز!
لە قفڵی زمانتدا هەزاران وشەی بەندی کراوم دەدیت
کە دوای چرکەیەک دەمردن.

گەرچی تۆ رۆیشتی لە نێومان
پێم خۆشە خەمت وەک شیعرت بمێنێ
خەمێکی شیرین
وەفا گیان![١]

---

[١] گۆڤاری مەڵبەند، لەندەن، ژمارە ٩٦، نەورۆزی ٢٠٠٦

## پەیامی سەرەخۆشی

پرسەنامەی نووسەران و شاعیرانی بۆکان

بە ناوی خوا

*ئای... چەندە غەریبم*
*لەوانەی وا خۆشم دەوێن*
*چەندە نامۆم*
*بۆ ئەوانەی خۆشیان دەوێم*
*چلۆن ون بووم*
*لە شەقامی لێ لێهاتووی*
*ئەم ژیانەدا..*

بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە "وەفا" شاعیرە ناوئاشنای وڵاتەکەمان بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە ژیان کرد. کۆچی دوایی وەفا پەژارەیەکی زۆری خستە سەر دڵمان. وەفا لەو شاعیرە بە توانایانەی ئەمڕۆ بوو کە بەردەوام لە هەوڵی تازە کردنەوەی زمان و ناوەرۆکی شیعردا بوو و خۆی ئەیگوت *"ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین زمانێکی نوێ و پێشکەوتوو لە ئاسەواری ئەدەبی ئەوڕۆماندا بەکار بێنین"*.

وەک شیعرەکانی ئاشق بە سروشت و جوانی بوو. لە زمانی پاک و رووبارانەیدا خوێنەر هەستی بە چەشنێک ژیانەوە و خۆشەویستی دەکرد. سەرانسەر وشەکانی دەرد بوو، دەردی چاوەڕوانی و نەسرەوتن. وەفا ئەو شاعیرە غەریبە، بە یەکجاری "شەقامی فیٚلێهاتووی" ئەم ژیانەی بەجیٚ هێشت و بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لیٚکردین، بەو بۆنەوە پڕ بە دڵ سەرەخۆشی خۆمان ئاراستەی بنەماڵەی بەڕێزیان وهەموو خەڵکی کوردستان دەکەین.

محەمەد نووری
فەتاح ئەمیری
سەعید نەجاڕی
هادی حەبیبی
محەمەد رەمەزانی
ناسر وەحیدی
ئەمین گەردیگلانی
کەریم حیکمەتی
عەبدولعەزیز مەولوودی.[1]

٢٠٠٥/١٢/٩

[1] ماڵپەڕی www.bokan.de

*دەبا ئەم بێدەنگییە بەم ترپەیە بشکێ تا داگیرسێینەوە بە دەم شنەی ناڵەشکێنەوە*

(....،...)

کە فووت لە مۆمی هیلاکی کرد
ئاماژە قورسەکانت دەرکەوتن،
چ چۆڵ بووم...
هاتم هەلاڵەی خۆشەویستیت بچنم،
رۆیشتبووی...
ئەمێستاکە
جۆگەلە بەستووی درەختێکم
بە دەم قیژەی پەڕەسێلکەوە

چەپکێ گوڵی سوور بە دوورە یادی عومەری سوڵتانی "وەفا" دەسپێرین.

رەحیم سورخی (نووسەر)
سولەیمان دڵسۆز (چیرۆکنووس و وەرگێڕ)
وریا بوداغی (شێوەکار)
ئاسۆ مامزادە (گرافیست)
عەتا جەماڵی (شاعیر)
ئیسماعیل ئیسماعیلزادە (شاعیر و وەرگێڕ)

به ناوی خودا

هەواڵی کۆچی دوایی عومەری سولّتانی "وەفا" منیشی خەفەتبار کرد، سەرەخۆشی خۆم ئاراستەی بنەماڵەی وەفا و هەروەها ئاراستەی هەر نووسەرێکی کوردستان دەکەم، بەو ئاواتە کە هەوڵ بدرێ شیعرەکانی وەفا چاپ و بڵاو بکرێنەوە و چاوی خوێنەرانی پێ رووناک بێتەوە، هیواداریشم خودا بیبەخشێ و ببێتە هۆی تەمەن‌درێژی هەر نووسەرێکی کە لە بواری فەرهەنگ و ئەدەبدا هەوڵ دەدا و چالاکی هەیە.

محەمەدڕەزا شەفیعی کەدکەنی

تاران ـ ١٣٨٤/٩/١

به ناوی کوردستانی گەورە

پەیامی ح.س. سۆران بە بۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا عومەر سوڵتانی "وەفا"وە

کۆچی دوایی هۆنەری ناسک خەیاڵ و وردبین، کاک عومەر سوڵتانی "وەفا" بۆ کۆمەڵی فەرهەنگی کوردستانی گەورە، بە کۆسپێکی هەرە مەزن و دڵتەزێن دەزانم و بەم بۆنەیەوە، پرسە لە تەواوی گەلی گورد و برای خۆشەویستی، کاک ئەنوەر سوڵتانی دەکەم.

دڵنیام کە هۆنراوە شازەکانی کاک وەفا، لە گەنجینەی مێژووی وێژەی کورددا بەڕێزەوە لە ریزی سەرەوە دادەنرێن.

تاران ـ ٣ی سەرماوەزی ٢٧٠٥

## بێ وەفاییە یادی وەفا نەکرێت

محەممەدسەعید نەجاری

*مەڵێن بۆ شاری بۆکان تازیەدارە،*
*قەڵای سەردار خەمی تێدا دیارە*
*مەڵێن بۆ حەوزەگەورە ئاوی کەم بوو*
*مەڵێن بۆ کێوەڕەش لێوی بەبارە*
*مەڵێن بۆ ڕیتمی شیعری شاعیرانمان*
*دەڵێی سیمی پساوی عوود و تارە*
*لە کۆڕی شاعیرانی شاری بۆکان*
*"وەفا" جێی خاڵییە و جێی هەر دیارە*

«ئاسۆ»

هەمیسان پایزە و وەرزی زەردی و جودایی، وەرزی گەڕانەوەی مەلە کۆچەریەکان، وەرزی بارانی ئەسرینی جودایی. بەڵام ئێمە ریشەمان لە ئاودایە، بە هەر پەڵەی پایزێ هەڵدەوەرێین و لەگەڵ گرمەی هەوری بەهارێ دووبارە سەر هەڵدەدینەوە، دەژیێینەوە، ژیان مانا دەکەینەوە و بە شیعر، مانای تازەتری دەدەینێ.
بەڵێ بە شیعر، چونکا شیعر فووی مەسیحایە بۆ لەشی بێگیانی سروشتی مرۆڤ، شاعیران ـ کە وەک شەمی سەر مەزاری هەمیشە زیندوانن، بە هیچ رەشەبایەک ناکووژێنەوە و ئەو کاتەی کە بای نەمان پەردەی ژیانیان

هەڵدەداتەوە، تازە ئەو کاتەیە یادیان تازە دەبێتەوە و بۆ شیعر و نووسراوەکانیان مانای تازەتر دەدۆزرێتەوە.

***

پایزی ساڵی ٢٠٠٥ کۆڕی ئەدیبانی شاری بۆکان، ماتەمێکی گەورەی بەسەرهات، ماتەمێکی هەرگیز لەیاد نەچوو، ماتەمی کۆچی دوایی کاک عومەری سوڵتانی ناسراو بە "وەفا". ئیدی پەڕەسێلکەکان سروودی وەفادارییان بە دندووکەوە نەما و "پڕشنگ" ئاوری لە قەڵەمی وەفا نەپریشکایەوە و ناپریشکێتەوە. هاواری شیعری تازەی وەفا بە گوێی سروشتدا ناچرپێ.

"وەفا" شاعیری هەست و جوانی و خەم و هاوار بوو. هەرکەس جارێکی دیتبێ و لە کۆڕی شیعری وەفادا گوێی دڵی دابێتە شیعرەکانی، هەرگیز لە بیری ناچێتەوە. بەتایبەت من، کە ساڵەهایە موریدی شیعر و ئیلهامی وەفام ـ ئیلهامی وەفاش، بۆکان، حەسەن زیرەک، حەوزەگەورە، قەڵای سەردار، باغی میراوا و ناڵەشکێنەیە. لەگەڵ هاتنەوەی هەر پایزێک وەفاداریم دەکولێتەوە و بێ"وەفا" بوونم لێ دیاری دەدات، دڵم تەنگ دەبێ، ئاخر چۆن دڵتەنگ نەبم؟ ئیدی شیعرە تازەکانم یەکەم جار لای کێ بخوێنمەوە؟ راستە وەفا بە رۆح هەر لای شاعیرانی بۆکانە، بەڵام چیتر بە زاری خۆی شیعری "شەوبۆ"مان بۆ ناخوێنێتەوە، تازە ئاگری پڕسۆزی ئەویندارییی ئاسۆ بە شیعری هیچکەس وەک هی وەفا ناگەشێتەوە. بەڵام چ دەکرێ؟ بە قەولی کاک سوارەی نەمر دەفەرمێ:

*مەرگە دوایی بە هەموو شت دێنێ*
*هەموو ئاواتێ لە دڵ دەستێنێ*

ساڵانی کۆتایی چلەکان لە ئێران و سەرەتای پەنجاکان لە بۆکان[١]، قوتابییەکی تاقە دەبیرستانی شار بووم. هەموو کاتێ کە بە بەر دووکانی وەفادا رادەبوردم، بە تامەزرۆییەوە دەمڕوانییە ناو دووکانەکە. حەتمەن چەند کەسێکی شەیدای شیعر و ئەدەبی لێبوون کە قاقا پێدەکەنین یا بزەیان لە سەر لێو بوو و لە شیعر و ئەدەب دەدوان. بە حەسرەتەوە رادەبوردم و تەمەن و هەلومەرجی ژیان هەرگیز ئەو هەلەی بۆ نەڕەخساندم کە لە نزیکەوە یەکتر بناسین.
وەفا لە بۆکان رۆیی و دەستی رۆژگار هەڵیدایە ورمێ و پاشان لە تاران گیرسایەوە. ئیدی منیش ببووم بە مامۆستای قوتابخانە و لە زانستگەی شاری «سەبزەوار» ئەدەبیاتم دەخوێند. هاتوچۆی تارانم دەستپێکرد و یەکەم بەرهەمی چاپیم لە ساڵی ١٣٦٧ (١٩٨٨) چاپ کرا. وەفا لە تاران، من و کتێبەکەمی دیت و خۆشی ویستین و شیعری لێ بیستین. هەرکات بچووبامە تاران یان لە سەبزەوارڕا بگەڕابامەوە، نیوەی رێگا لە لای وەفا دەحەسامەوە و تەنانەت جارێک پێکەوە دیداری مامۆستای نەمر «هەژار»مان کرد. وەفا لەوێ فەرمووی: «مامۆستا، ئاسۆ درەنگی دەست پێکرد، بەڵام زوو ئێمەی گرتەوە.» ئەم تەشویقەی کارێکی وای کرد کە منیش هەندێ شایی بەخۆ بم.

لە شەقامی «سپەهبود قەرەنی» تاران، ماڵی وەفا جێی حەسانەوە بوو بۆم. ئەویش بە دیتنی من شاد دەبوو، دەهاتەوە دۆخەکەی ساڵان و بە شیعری فارسی و کوردی، بۆکان و موکریان و هەڤاڵان و نیشتمانمان دەلاواندەوە. تا وای لێهات کە سەرئەنجام دوای چەندین ساڵ دووریی وەتەن، وەفا گەڕایەوە کوردستان و لە بۆکانی زادگای خۆیدا نیشتەجێ بووەوە. بەڵام بە داخەوە ٢٠ ساڵ دوورە وەتەنی پەڕوباڵی هەڵپڕووزاندبوو و دڵی نەخۆش خستبوو. وەک کەوی ناو قەفەس جاروبارە خرۆشێکی بە یادی دەشت و

[١] کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانی زایینی

چیا و بناری کوردەواری، بە گەروودا دەهات، کە بۆنی غەریبی لێ دەکرا. هەرکات شیعرێکی تازەی دەبیست، لە ژێر چاویلکەکانیەوە فرمێسکی زوڵاڵی دەهاتنە خوارێ و بە بزەیەکی رەزامەندانە، شاعیرەکەی تەئیید دەکرد. لە کۆتاییدا نەخۆشییەکەی هەر هات و لە ناو ماڵ قەفەسیی کرد ـ لە ماڵێکی زۆر خۆشدا و لە لای بنەماڵەی دڵسۆز و خۆشەویست، بەتایبەت کوڕە چکۆڵەکەی "هێرش" و خێزانەکەی خۆشی وەک پەروانە بە دەوری شەمی روخساریدا هەڵدەسووڕان و بەو نەخۆشییە نازیان دەکێشا. وەفا کەوتبووە سەر جێوبانی مەرگ و دەبا بڕۆیشتبایە بۆ لای ئازیزانی ئەولا. وەک گەوهەر لە نێو سەدەفدا نیگاداری کرا، بەڵام بە قەولی مام هێمن دەفەرموێ:

*مەلێکی فێری دارستان و لێڕ بێ*
*قەفەس پیری دەکا، با شووی لە زێڕ بێ*

سەرەنجام، بەرەبەیانی رۆژی ١٣٨٤/٩/١١ (٢٠٠٥/١١/٢٢)، دڵە پڕهەست و ئەوینەکەی لە لێدان کەوت و لەگەڵ فرمێسکی هەزاران شەیدای شیعر و ئەدەب و نیشتمانپەروەرانی شاری بۆکان، لەپاڵ گڵکۆی شاعیری گەورەی موکریان ـ مامۆستا عەباسی حەقیقی ـ بە خاک ئەسپێررا. یادیان بەخێر و بیرەوەرییان پیرۆز.

محەمەدسەعید نەجاڕی (ئاسۆ)
بۆکان ـ ١٣٨٥/٨/١٤[١]

---

[١] لە رۆژنامەی ئاسۆ، چاپی سلێمانی، ژمارە ٣٢١، ٢٠٠٦/١١/١دا بڵاو کرایەوە

# رێورەسمی رێز لێنان لە "وەفا"ی شاعیر

لە ساڵوەگەڕی ماڵاواییدا

بۆ رێزگرتن لە یاد و تێکۆشانی ئەدیبی خوا لێخۆشبوو مامۆستا عومەر سوڵتانی "وەفا" رۆژی ٣٠ گەلاڕێزانی ٢٧٠٦ (٢١ نوامبری ٢٠٠٦) لە یەکێک لە بنکەکانی پارتی ئازادیی کوردستاندا رێورەسمێک بەڕێوە چوو.

رێورەسمەکە بە پەیامی کاک حسەین یەزدانپەنا جێگری سەرۆکی PAk بەو بۆنەیەوە دەستی پێکرد. لە پەیامەکەی بەڕێزیاندا، وەفا بە رچەشکێن و پێشەنگی نوێگەریی شیعر لە رۆژهەڵاتی کوردستان و سوارچاکی ٥٠ ساڵەی ئەو مەیدانە وەسف کرابوو.

لە رێورەسمی رێز گرتن لە وەفای شاعیر، هەڤاڵ "فەرەیدوون قەنبەروەیسی" بەرپرسی کۆمیتەی فەرهەنگیی پارتی ئازادیی کوردستان پەیڤێکی بەو بۆنەیەوە پێشکەش کرد. کاک فەرەیدوون، لە وتەکانیدا باسی لە تێکۆشانی ئەدەبی مامۆستا وەفا لە رۆژهەڵاتی کوردستان کرد و چەند بیرەوەرییەکی خۆی لە خزمەت بەڕێزیاندا

گێڕایەوە. بەرپرسی کۆمیتەی فەرهەنگی PAK وتی: *"مامۆستا وەفا لە ساڵەکانی دوایی تەمەنیدا، پێوەندیی بە ناوچەکانی کرماشان و ئیلام و جوانرۆوە گرتبوو و ماڵەکەشی لە شاری بۆکان مەکۆی ئەدیبانی کەڵهوڕ و فەیلی بوو."*
ناواخنی پرۆگرامەکانی ڕێوڕەسمەکە خوێندنەوەی بەشێک لە شیعرەکانی وەفا بوو.

کۆمیتەی ڕاگەیاندنی پارتی ئازادیی کوردستان
٢٠٠٦/١١/٢٤

## دەقی پەیامی بەڕێز کاک حسەین یەزدانپەنا

ساڵی ڕابردوو ئەم کاتانە، خەزانی مەرگ، گوڵی ژینی شاعیری هەست ناسک و گوڵبەدەم، مامۆستا عومەر سوڵتانی "وەفا"ی هەڵوەراند.
کۆچی دوایی وەفا هەر لەو کاتەدا کە خەسارێکی گەورە بوو بۆ کاروانی شیعر و وێژەی کوردی، کۆستێکی گرانیش بوو بۆ هەموو ئەوانەی تاوێک لە ژێر ساباتی هەست و سۆزی ئەودا وچانیان دابوو.
هەرچەن وەفا زیاتر وەک سەربازێکی ونی مەیدانی شیعری کوردی هات و ڕۆیی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ڕچەشکێن و پێشەنگی نوێگەریی شیعر بوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و پتر لە نیو سەدە سوارچاکی

ئەو مەیدانە بوو. یادی وەفا و ناوی وەفا لە دڵی ئەویندارانی شیعر و پەیڤی کوردیدا بە نەمری دەمێنێتەوە.

هەر بژین
براتان: حسەین یەزدانپەنا
٣٠ خەزەڵوەری ٢٠٠٦

**دەقی وتەکانی هەڤاڵ فەرەیدوون قەنبەروەیسی**

ساڵێک لەمەوبەر دڵی شاعیری وردبین و خاوەن هەستی نەتەوەکەمان کاک عومەر سوڵتانی "وەفا" لە تەمەنی ٦٦ ساڵیدا لە لێدان کەوت و بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لە کاروانی ئەدەب و هونەری نەتەوەکەمان کرد.
مامۆستا عومەری سوڵتانی "وەفا" شاعیرێکی بەتوانا و شۆڕەسواری هەر دوو زمانی کوردی و فارسی و یەکەمین دانەری شیعری نیمایی بە زمانی فارسی لە کوردستان و شارەزا و لێهاتوو لە هونەری خۆشنووسی بوو.
ئەوەی کە سەردانی ریستۆرانی شادی لە شارە خنجیلانەکەی بۆکانی کردبێ یەکەمین شتێ کە سەرنجی راکێشابێ، وجوودی هونەر بوو لەو شوێنە، کە شیعری زۆر لە شاعیرانی کورد بە خەتی جوان بە دیواری ریستۆرانەکە هەڵواسرابوو، هەروەها وێنەی مامۆستا زیرەکی نەمر هەڵواسرابوو کە فەرمانداری شاری بۆکان (ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی) ناڕەزایەتیی لە هەبوونی وێنەی زیرەکی نەمر لەو شوێنە دەربڕیبوو و داوای لابردنی کردبوو.

مامۆستا وەفا لەساڵی ١٣٣٢ هەتاوی کاتێ کە لە لایەن حکوومەتی نیزامی تەیموور بەختیارەوە دوا بە دوای کودەتای ٢٨ی گەلاوێژ دەستگیر کرا و لە زیندانی مەهاباد زیندانی کرا، پارچە شیعرێکی بە زمانی فارسی هۆنیوەتەوە کە بە یەکەم شیعری نوێ بە زمانی فارسی لە رۆژهەڵاتی کوردستان دەناسرێ. مامۆستا وەفا بەر لە ساڵی ١٣٥٧ی هەتاوی لەگەڵ گۆڤارەکانی ئەودەمەی (آدینە، امیدایران، سپید و سیاه، ترقی، آسیای جوان و خوشە) پەیوەندی هەبووە و لە گۆڤارە ئەدەبییەکانی فارسی زمانی ئەو سەردەمە زۆر شیعری بە چاپ گەیاندووە. هەر لەو سەردەمانەدا کۆمەڵە شیعرێکی بە زمانی فارسی بە ناو "سرود پرستو" لە تاران بە چاپ گەیاند.

سەبارەت بە شیعرەکانی کاک عومەر، ئوستاد شەفیعی کەدکەنی، شاعیر و رەخنەگری ناسراوی فارس دەڵێ: *«وەفا لەو شاعیرە بەتوانایانەی ئەمڕۆیە کە وەک شاعیرێکی غەیری فارس لە هۆنینەوەی شیعری نوێی فارسیدا بە باشی درەوشاوەتەوە.»* بەڵام مامۆستا وەفا دوایی لە ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی رووی کردە شیعری کوردی و زۆی شیعری جوانی بە زمانی کوردی هۆنیەوە کە لە هەفتەنامە و گۆڤارەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان بەتایبەت گۆڤاری سروە هەندێ لەو شیعرانە بڵاو بوونەتەوە و ئیتر رووی لە شیعری فارسی نەکردەوە.

زمانی شیعری مامۆستا، زمانێکی ساکار و رەوان و پڕ بە هەستی خۆشەویستییە. کاک عومەری سوڵتانی جیا لە کەسایەتیی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی، کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەر بوو. هاندەری لاوان بوو بۆ خزمەتی زیاتر بە زمانی کوردی و کۆکردنەوەی کەلەپووری

کوردی و بە چاپ گەیاندنیان بەتایبەت لاوانی ناوچەکانی کرماشان و ئیلام و جوانڕۆ. هەر لەم پێوەندییەدا ئاماژە بە کاریگەری کاک عومەر لە سەر پێوەندیی کوردە کەڵهوڕ و فەیلی و جافەکانەوە بە ناوچەی موکریان دەکەم.
ئاشنایەتی ئێمە دەگەڵ کاک عومەر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی، مانگی گوڵانی ئەو ساڵە دوو برای بەڕێز و خۆشەویستم کاک موحسین خالیدی و شاعیری شەهید و جوانە مەرگ کاک مارفی ئاغایی قەرار بوو لە لایەن گۆڤاری سروەوە سەردانی ناوچەی کرماشان و ئیلام بکەن، ئەودەمە من لە شاری شائاباد بووم دەگەڵ بەڕێزان کاک هوشەنگ رەشیدی و فەرهادی عەزیزی و هەندێ هەڤاڵی تر خەریکی چالاکی فەرهەنگی و کۆکردنەوەی شیعر و پەندی پێشینیان و پەرەدان بە زمانی کوردی لەو دەڤەرە بووین، خەڵکی نەیاندەوێرا بە باوەڕێکی تەواوەوە بڵێن ئێمە کوردین و ئەگەر بیانویستایە باسێک لەو بارەوە بکەن باسی عەشایری "غەربی کشوەر" و "مەرزداری عەشایر"یان دەکرد. شاعیرە کوردیبێژەکان کەوتبوونە پەراوێزەوە، لە ئەنجوومەنە ئەدەبییەکاندا بە بێنرخییەوە دەیانڕوانییە زمانی کوردی و هەر ئەو جۆرە کە داگیرکەران فێریان کردبوون بە زمانی کوردییان دەگوت: گویشی کوردی و محەلی و زمانی کوردییان بە گویشێک لە زمانی فارسی دادەنا، ئەو سەردەمە تا ئەمڕۆ رەنگە زەمانێکی فرە نەبێ، بەڵام بەڕاستی جیاوازییەکی زۆری دەگەڵ ئێستا هەبوو، بەتایبەت لە ناوچەی کرماشان و ئیلام و... تاریکی بەرقەرار و شەمشەمەکوێرەکان زاڵ بوون، نائومێدی سێبەری خستبوو بە سەر هەر جۆرە هەست و بیرێکی نەتەوایەتی و کوردایەتیدا، مەسەلەی مەزهەبی و نەگەیشتنی بزووتنەوەی

رزگاریخوازانەی کورد لە ساڵانی سەرەتای راپەڕینی گەلانی ئێران بەو ناوچانە کەلێنێکی زۆری خستبووە نێوان ئەم بەشەی کوردستان و بەشەکانی تر.
ئەوکات سەردەمێک بوو کە گۆڤارێکی کوردی دەهاتە شاری شاەئاباد، تەنیا سێ دانەی دەفرۆشرا، ئەویش خۆمان دەمانسەند. لەو سەردەمە بوو کە کاک موحسین خالیدی و کاک مارف ئاغایی دەگەڵ کاک عومەر و کاک حەمەی حەمەباقی سەردانی لای ئێمەیان کرد.
شەو لە ماڵی برای دڵسۆز و نیشتمانپەروەرم کاک هوشەنگ رەشیدی کۆبووینەوە. بەڕێزان فەرهادی عەزیزی و چەن کەسێکی تریش، ئەوشەوە لەوێ بوون، تا درەنگانێ سەبارەت بە زمانی کوردی و زاراوەی کەڵهوڕی باسمان کرد و ئێمە داوامان کرد بۆ ئەوەی خەڵکی ناوچەکە روو بکەنە خوێندنی گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکان، دەبێ سەبارەت بە مێژوو و زاراوەی ناوچەکە لەو گۆڤار و رۆژنامانەی کە بە زمانی کوردی لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێران دەردەچوون جێگایەک بکرێتەوە، یەکێک لەو کەسانەی کە پشتگیری ئێمەی کرد تا داواکارییەکەمان قەبووڵ بکرێ خوا لێخۆشبوو کاک عومەری سوڵتانی بوو.
شایانی وتنە ئێمە بە یارمەتی کاک عەلی فەیلی لەوەو بەر توانیبوومان هەندێ شت بە زاراوەی کەڵهوڕی لە گۆڤاری ئاوێنە بڵاو بکەینەوە و ئەو شەویشە توانیمان قەولی ئەوە لە کاک موحسین خالیدی و شەهید کاک مارف وەربگرین (بە ئامادە بوونی مامۆستا وەفا و کاک حەمەی حەمەباقی) کە بە زاراوەی کەڵهوڕی وتار و شیعر بڵاو بکرێتەوە.

لەو چەن رۆژە کە لە خزمەتی مامۆستا وەفادا بووین، مامۆستا گەرچی ناساق بوو، بەڵام زۆر پێی خۆش بوو ئەو بەشەی کوردستان بگەڕێ و شوێنە پیرۆزەکانی یارسان زیارەت بکا. هەر بەم بۆنەوە من و کاک فەرهادی عەزیزی و کاک هوشەنگی رەشیدی دەگەڵ مامۆستا و هاڕێیانی کەوتینە ڕێ. سەردانی رێژا و گاوارە و کرند و بابایادگار و سەرپێڵی زەهاو و قەسری شیرینمان کرد، رۆیشتینە گاوارە بۆ خزمەت بەڕێز سەید نەسرەدینی حەیدەری رێبەری ئایینی ئەهلی هەقەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان لە گوندی تووشامی، بەڵام بە داخەوە نەمانتوانی بیبینین. لە شاری کرندیش رۆیشتینە زیارەتگای ئەهلی هەقەکان. هەروەها زیارەتگای بابایادگارمان زیارەت کرد و لەوێ بوو کە کاک حەمەی حەمەباقی ئەو شیعرەی مامۆستا مەولەی کوردی خوێندەوە کە لە سەر بابایادگار هۆنیویەتەوە. دوایی لە قەسری شیرینەوە رۆریشتین بۆ شاری گێڵانغەرب و شەویش گەیشتینە شاری ئەیوان.

لە شاری ئەیوان خانەوادەی بەڕێز عەلیڕەزا خانی زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێمان کرد و هاتن پێمانەوە تا رادەیەک کە کاک عومەر سوڵتانی وتیان کاکە ئەگەر ئێوە بێن بۆ لای ئێمە، ناتوانین وەها بێین پێتانەوە.

کاک عەلیڕەزا خۆی لە ماڵ نەبوو و لە ئیلام بوو، بەڵام بە بوونی کەس‌وکار و بنەماڵەی ئەو بەڕێزە و دەربڕینی هەستی کوردانەیان هەستمان بە نەبوونی کاک عەلی نەکرد، دوای شام ئێمەش رۆیشتین بۆ ئیلام بۆلای کاک عەلی، شەو لە لای کاک عەلی بووین. زۆر گەنجی ئیلامی بەهەست و سۆزێکی کوردانەوە لە دەوری مامۆستا و هاوڕێیانی کۆ بوونەوە و بە گەرمی باسی زمان و ئەدەبیات و

مێژووی کوردی ئیلام و دەوروبەریان دەکرد. هەر لەو کۆبوونەوەدا بوو کە کاک عومەری سوڵتانی بڕیاری دا هەندێ خەرجی چاپی کتێوی کوردی لە ئیلام و کرماشان بە ئەستۆ بگرێ، بۆ نموونە شیعرەکانی شاکە و خان مەنسوور کە کاک عەلیڕەزا خانی کۆی کردبوونەوە. لەو سەفەرەدا بوو کە مامۆستا عومەری سوڵتانی پەیوەندییەکی گەرم و گوڕی لەگەڵ هەندێ لە نووسەران و شاعیرانی ناوچەکە بەرقەرار کرد و دوای گەڕانەوە لە ئیلام مامۆستا و هاوڕێیانی سەردانی کەسایەتییە ئەدەبی و ئایینییەکانی کرماشان و شاری جوانڕۆیان کرد و گەڕانەوە بۆ موکریان. بەڵام مامۆستا نەیهێشت ئەو پێوەندییە ببڕێ و بەردەوام لە پەیوەندیدا بوو تا دوایین ساتەکانی ژیانی و لەو ڕۆژە بە دواوە ماڵی مامۆستا لە شارە خنجیلانەکەی بۆکان بوو بە مەکۆ و بنکەیەک بۆ کوردەکانی ئیلام و کرماشان و جافەکانی جوانڕۆ و کەم کوردی فەرهەنگدۆستی فەیلی و کەڵهوڕ و جاف هەبوو کە بڕواتە شاری بۆکان و سەردانی مامۆستا وەفا نەکا.

یادی پیرۆز و نموونەی زیاتر و زیاتر بێت.

## شینی مامۆستا وەفا

رەسووڵ چووپانی جانبڵاغ (شوانە)

... باغچەی ئەدەبی کورد رازاوەبوو
بەو بەرزی "وەفا" دڵ پاراو ئەبوو

"شوانە" کوردستان جێگەی زانینە
بێشکەی خەڵکانی قەڵەم رەنگینە

شاری بۆکانیش شانازیی هەیە
رێڕەوی بەرزی رێبازی هەیە

لە مێژووی بۆکان تۆیش ئاسەواری
وەک حەوزەگەورە و قەڵای سەرداری[١]...

---

[١] رۆژنامەی ئاسۆ، سلێمانی ژمارە ٣٢١، ٢٠٠٦/١١/١

## بابی گیان چۆنی؟

هێرش سوڵتانی[١]

ئاخ دیسانەکە درەنگ گەیشتمە زەمان و لە عەقرەبەی سەعات مامەوە. دیسان پێش ئەوەی بگەمە مراد، دەرکرام. چارەنووسی من وەفایەک بوو و تۆ هەموو ئەو کۆترە بووی کە بە من پێکەنی و رۆیشتی.

ئەوەی دەینووسم، داستانی وێرانی کاخی ئاواتمە، مردنی منە لە ناو خۆمدا و هەندێک ئەولاتر، لەناوچوونمە. لە پشت دەلاقەی ئارەزووەوە سێبەری نازەنینێک دەبینم کە شاخە گوڵی ئەوینی بە پرچی نامۆیەکەوە هەڵدەواسی. من لە ژێر قورسایی چاو و سووکیی ئاسمانی و ئاوێنە، تێکشکام و دەمەوێ ئەوین بکەمە هاوڕێیەک کە لە تەنیاییدا بملاوێنێتەوە.

---

١ هێرش کوڕە چکۆلەی وەفایە و لە سالانی نەخۆشی و ناو جێگای وەفادا زۆری خزمەت کرد. ئەو هەر لە منداڵییەوە بە باوکی دەگوت: "بابی".

"بابی گیان"! چۆنت باسی دڵم بۆ بنووسم؟ جاران باسی دڵی خۆمت کاتێ بۆ دەکردی کە سەری لەشی بیمارتم دەدا، بەڵام ئێستا هێلانەی هیوام ڕەنگی پەژارە و زەردیی خەزانی گرتووە و کۆچەکەت هەردەم لە خوێنمدا بڵێسە دەستێنێت. هێزی ئەژنۆم نەماوە بابی گیان!

کاتێ لە ژیان ورد دەبمەوە و جێگەی تۆی تێدا بەتاڵ دەبینم، دڵم وەک دەنگی تۆ دەگیرێت، پەژارەی ژیانی بێ‌تۆ، تەنیا لەسەر زاری نووسەرێک خۆش دێت کە لە دوورڕا دەنووسێت و باست دەکات؛ بەڵام بۆ من، یادی تۆ، بۆنی تۆ و تەنانەت جێگەوبانی سارد و بێ‌گیانی تۆ چقڵێکن هەردەم لە دڵم هەڵدەچەقن، بۆ بەجێت هێشتم بابی؟

تەمەنی پڕ لە شانازیت بۆ هیچکام لە ئێمە گرنگی نەدەنواند تا ئەو دەمەی بەجێت هێشتین، ئەوکات بوو زانیم من کێم و تۆ چ تۆیەکی!

چۆنت بیر نەکەم؟ چۆن هەناسەم بۆ چاوەکانت نەوەستێ؟ چۆن، چۆن، چۆن دڵم دارماڵی خەمت نەبێ؟ ئەوەی بۆت بەجێ هێشتم خەمێکی نامۆیە، بەڵام بۆنی تۆی لێ‌دێت، پەژارەیەکە، لاوێکی دڵسووتاوی داگرتووە کە چاو لە هێلانەی هیوای تۆدا کرایەوە و تەنیا غەریبێک دەیزانێ کە دڵی لە زێدەکەیەتی و لەشی لە غەریبی.

نازانم چۆنت باسی دڵم بۆ بکەم؟ کۆڵەکەی ماڵی دایکم بە کۆچی تۆ ڕووخا و هیوای سەوزی جگەرگۆشەکانت بەو ماڵئاواییە ڕەنگی خەزانی گرت. تەنیا گڵکۆی شاعیران بوو کە بەزمی خۆشی بۆ گرتی، دەی بۆ ڕۆیشتی؟

لێوە سارد و سڕەکانت، دەنگی گیراوی حەبسکراوت، چاوی چاوەڕان و دڵی سووتاوی پڕ لە دەرد و عەشق و ئومێدت، ئێمە هەموویمان بە چاوی سەر دەدیت و لە بای خەزان پاڕاینەوە گوڵی

تەمەنت هەڵنەکەنێ. بەڵام ئەو دەستی خستە سەر "چەپکە گوڵێک"[١] کە بۆنی ژیانی لێدەهات. من وەرینی گەڵای ژینی تۆم بە سەر داری ژیانتەوە بە چاوی خۆم بینی، ئێستاش دەیبینم و هەرگیز لە یادم ناچێت.

شیعرەکانت بابی گیان، مەڵحەمی دەردی منن. ئەو کاتەی وا دەتنووسی:

*نیوەشەوە*
*دەستم بۆ خۆشەویستی دەگەڕێت*
*خەونی کاڵ دەبینم...*

من لە لات بووم. دەتگوت رازی دڵی هەموو ئەویندارانی سەر زەوی لە شیعرەکانتدا شاراونەتەوە.

وەفای ناسکخەیاڵ! هەستە، لەگەڵ تۆمە، هەستەوە، دەستم بگرە، لە باوەشم بگرەوە با باری قورسی جوداییەکەمان سووکتر بێت، دەزانم تۆش وەک منی وەفا! دەزانم بیرم دەکەی، بیرمان دەکەی، منیش بە گڵکۆی وەفا سوێند دەخۆم لە بیرم نەکردووی، هەر لە دڵمدای و هەرواش دەمێنی.

تۆ خودا بابی گیان چۆنی؟[٢]

---

[١] وەفا ئەو ناوەی چەندین ساڵ پێش مەرگی، بۆ کتێبەکە دانابوو، بەڵام ئێستا ناوی "چەپکێک لە گوڵ" ە.

[٢] رۆژنامەی ئاسۆ، سلێمانی ژمارە ٣٢١، ٢٠٠٦/١١/١

## ساڵێک بێ"وەفا"

ئەنوەر سوڵتانی

وا ساڵێک بە سەر کۆچی بێوادەی کاکمدا تێپەڕ بوو، ساڵێکی پڕ لە بێ"وەفا"یی. من هەرگیز بیرم لە ژیانی بێئەو و دوور لەو نەکردبۆوە و خۆم بۆ ئامادە نەکردبوو. پەیوەندیمان لەوە نزیکتر بوو کە بیر لە ئامادەییەکی ئەوتۆ بکرێتەوە.

هەست دەکەم و نیشانەی زۆریشم بە دەستەوەن کە سەفەری خۆیشم نزیک بۆتەوە و دەبێ لە بیری یەکگرتنەوە لەگەڵ وەفادا بم. دەزانم لە ماوەی ژیانیدا ستەمی زۆری لێکرا. مافی فەوتا و ناوی زڕا، بەڵام هەرگیز بێوەفایی بە کەس نەکرد و هەوڵی قەرەبوو کردنەوەی ئەو زوڵمانەشی نەدا کە لێیان کرد. وەفا بە مەزڵوومی مرد.

یەکەم شاعیری رۆژهەڵاتی کوردستان بوو کە چەمکی نوێخوازی و تازەگەریی شیعری هێنایە ناو کۆمەڵگای داخراوی ئەودەمی موکریان و کوردستانەوە. بەڵام کاتێ باس لە پێشڕەوانی شیعری

نوێی ڕۆژهەڵات کرا ناوی ئەو لەگەڵ "سێکوچکە"ی شیعری نوێ نەهات، ئەوەش لە کاتێکدا کە هاوکات لەگەڵ ئەوان شیعرە کوردییەکانی لە ڕۆژنامەی کوردستاندا بڵاو دەبوەوە و تەنانەت شیعری نوێی فارسی بە چوار پێنج ساڵ پێش ئەوان گوتبوو، تەنیا کەسێکیش بوو کە بانگی نوێخوازی لە ناوخۆی کوردستانەوە بە گوێی خەڵکدا دەدا لەکاتێکدا سێ کەسەکەی تر لە تاران و لە فەزای نیوە ئازادی زانستگەدا دەنگیان بەرز کردبۆوە.

ئەوە تاقە ستەمێک نەبوو لە وەفا کرا. نووسەرێکی بۆکانی، مێژووی فەرهەنگ و ئەدەبی بۆکانی نووسی و تێیدا ناوی هەموو ئەو کەسانەی هێنا وا لە شار و گوندەکانی دەوربەر دەنکە جۆیەکی پاشای شیعریان خواردبوو، بەڵام دوور یا نزیک ناوێکی لە وەفا نەهێنا، لەکاتێکدا بە درێژاییساڵیان لە ئیدارییەکدا کاری دەکرد کە لە قاتی سەرەوەی دووکانەکەی وەفا بوو و بە گوێرەی دۆستایەتی و خزمایەتییەکی دووریش، ڕۆژانە سەری دووکانەکەی دەدا، شیعری دەخوێندەوە، شیعری دەبیست و تەنانەت شیعرەکانی وەفای هەڵدەسەنگاند.

ستەم بەوەش نەوەستا! ساڵی پار، ڕاست لەو ڕۆژانەدا کە وەفا لە بۆکان دوانەفەسی ژیانی دەکێشا، کوردستان تی‌ڤی پرۆگرامێکی دوور و درێژی لەسەر شاعیرانی بۆکانی بڵاو کردەوە و تێیدا لەگەڵ چەند کەس لە شاعیرانی شارەکە وتووێژ کرا. نە بەڕێوەبەری بەرنامە و نە هیچکام لە شاعیرە بۆکانییەکان لە کوولەکەی تەڕیشدا ناوی وەفایان نەهێنا. وەک ئەوەی وەفایەک لە شارەکەیاندا نەژیابێت،

رچەی نوێخوازی بۆ ئەوان و هەمووان نەشکاندبێت و بۆ ماوەیەکی ٥٢ ساڵە دەستەملانی پەریی شیعر نەبووبێت. یەک لە شاعیرەکان کەموزۆر هاوتەمەنی وەفا و دۆست و هاتوچۆکەری دووکانەکەی بوو، یەکیتریان خۆی بە "شاگرد"ی وەفا دەزانی و چەند ساڵ پێش وتووێژە تەلەفیزیۆنییەکە، کۆمەڵە شیعرێکی تازە چاپ کراوی خۆی پێشکەش بە وەفا کردبوو کە ئێستا ئەو نوسخەیە لای منە و کاتی خۆی کاکم هاوڕێ لەگەڵ کتێبی دیکەدا بۆی هێنابوومە لەندەن. شاعیری بەڕێز لە لاپەڕە ٣ی کتێبەکەیدا بە خەتی خۆی ئەم دێڕانەی نووسیوە:

*" وەفا گیان*
*دڵێکم هەن برینداری جەفایە*
*رەفیقی مەینەتی و نامۆی سەفایە*
*بەڵام بەینێکە جار جار شادە، پێموا*
*ئەویش هۆی تینی هەڵبەستی " وەفا" یە*
*وەک دیارییەکی بچووک بۆ لای زاتێکی گەورە: کاک عومەر سوڵتانی " وەفا"*

*شاگردت....*

بەڵام تینی ئەو هەڵبەستانە گەلێک زوور لە دڵی "شاگرد"ە هەستیارەکەدا سارد بوەوە و لە وتووێژی سەر تەلەفیزیۆندا، سووکە ئاوڕێکیشی لە مامۆستاکەی نەدایەوە، کە چوار ماڵ ئەو لاتری خۆی دەستەویەخەی مۆتەکەی مەرگ بووبووەوە.
تۆ بڵێی لە بیری چووبێت؟

ئەوانە تەنیا بەشێک لەو ستەمانەی لە وەفا کرا، شاعیرێک کە ٥٠ ساڵ دوای یەکەم شیعرەکانی، هێشتا هەر بە نوێکردنەوەی دیاردەی کۆن و رچەشکێنی و دۆزینەوەی رێبازی نوێوە خەریک بوو و لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا رووی کردبووە شیعری رەها. ئەو کەسە ئەگەر لە سەرووی دیوەخانی شیعردا رۆنەنیشانرێت، کە دەشبێ وا بێ، لای کەم بۆ ئەوە دەبوو لە پێشخانەی شیعردا پێڵاوی پێ جووت بکرێت، بەڵام ئەوەشیان پێ رەوا نەدیت، با مێژوو چەوتییەکانی ئێمە راست بکاتەوە!

*ئێمە دەرگانەی داد بووین، ئاوا ستەممان لێ چوو*
*داخوا قەسری ستەمکار چۆن تووشی نشووستی دێت؟*[١]

ئەوەی گوترا زیاتر گلەیی لە چارەنووسی کاکم بوو تا گازندەیەک لە خەڵکانی تر. من بەوپەڕی رێزەوە دەڕوانمە هەموو ئەو کەسانەی وا بۆ نموونە هێنامنەوە. دەشزانم وەفا چەندی خۆش دەویستن و چۆنی دڵ پێ دەکرانەوە. کێشەکە، زیاتر گشتییە و پەیوەندی بەو خەسڵەتە کۆنە عەشیرەییەوە هەیە کە لە هەمووماندا کەم یا زۆر هەیە و هەوڵی پووچاندنەوە و بێڕێز کردنی ئاوماڵ و دراوسێمان دەدەین. ئەوە خوویەکی مەترسیدارە و دوژمن بە باشی دەتوانێ

---

[١] ما بارگه دادیم، این رفت ستم بر ما
بر قصر ستمکاران تا خود چه رسد خذلان
خاقانی شروانی

کەڵکی لێوەربگرێت و دژ بە یەکتر بە کارمان بهێنێت، کوردیش لە بارودۆخێکدا نییە کە رووناکبیر و هەڵکەوتوانی لە جیاتی شەڕی دوژمن، یەکتر بپووچێننەوە، حزبە سیاسییەکانمان ئەم کارە دەکەن، پێویستێک بە یارمەتی ئێمە ناکات!

سەرکەوتوو بن.[١]

[١] رۆژنامەی ئاسۆ، ژمارە ٣٢١، سلێمانی ٢٠٠٦/١١/١